# تەنگژەکانی تیرۆریزم


بۆب چێرنۆ - ماپیۆ ج. مۆرگان

ئیریك هیرن - جیرالّد هۆلّتۆن

پاتریك هۆلّیز- برووس هۆفمان

**وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە**

مەروان کاکل- هێمن غەنی



کوردستان – هەولێر

٢٠٠٦





- **ناوی کتێب: تەنگژەکانی تیرۆریزم**
- نووسینی: بۆب چێرنۆ و ئەوانی دیکە
- وەرگێڕانی: مەروان کاکل و هێمن غەنی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال
- بەرگ: سەیوان
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپی یەکەم: هەولێر ٢٠٠٦
- تیراژ: ١٠٠٠
- ژمارەی سپاردن: ٢٣٦
- نرخ: ١٥٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

**بنکەی توێژینەوە**

زنجیرەی کتێب – ٣ –

**ناونیشان**

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی

پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com

ژمارەی تەلەفۆن : 2260311

www.mukiryani.com

## ناوەرۆک

# تیرۆریزم

برووس هۆفمان

و: هێمن غەنی — مەڕوان کاکڵ

تیرۆر، بڵاوکردنەوە و بەکارهێنانی تـرس و تۆقاندنـە بـە ئامـانجی بـەدیهێنانی گۆڕانکاری سیاسی. هـەموو کـارێکی تیرۆریـستی توندوتیـژی یـاخود هەڕەشـەی بەکارهێنانی توندوتیژی لەخۆ دەگرێت. ئەم کردارە توندوتیژانـەش لـە لایـەن ئـەو کەسانەوە یان ئەو کۆمەڵە کەسانەوە ئەنجام دەدرێت نا حکومین و بەشـێك نـین لـە هێـزی چـەکداری دەوڵـەت، یـان دەزگاکـانی سـەپاندنی یاسـا، یـاخود هـیچ دامودەزگایەکی دیکەی حکومی.

هەوڵی تیرۆریستان تەنها بڵاوکردنـەوەی دڵـەڕاوکێ و تـرس و تۆقانـدن نییـە، بەڵکو مەبەستیـشیانە متمانـە و بـاوەڕی هاوڵاتیـان بـە حکوومـەت و سـەرکردە سیاسییەکان لاواز بکەن لەو وڵاتەدا کە دەیکەنە ئامـانج. پیـادەکردنی تـیرۆر لـە بنەڕەتدا بۆ ئەوەیە بارێکی سایکۆلۆژی ترسناکی باڵا بەدەست بێت، ئەمە سەرەڕای ئەو قوربانیانەی ڕاستەوخۆ لە کردارە تیرۆریستییەکە دەکەونەوە.

تیرۆریستان مەبەستیانە گروپێکی بەرفرەوان لە خـەڵکی دووچـاری پەشـۆکاوی و شپرزەیی بکەن، جا ئەو خەڵکە گروپێکی ئایینی بن یان ڕەگەزی، یان سەرانـسەری و وڵاتێك بە سەرکردە سیاسییەکانەوە یاخود تێکڕای کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە.



بەگشتی گروپە تیرۆریستییەکان کۆمەڵە ئەندامێکی کەم و ژمارەیەکی کەم لە چەك و کەلوپەلی جەنگیان هەیە، بەشێوەییێکی بەراوردکارانە خاوەن سەرچاوەگەلێکی کـەمی خۆڕێکخستنن! هەر لەبـەر ئـەم هۆیەشـە هـەوڵ دەدەن کردارەکانیـان تـا دواسـنوور وێرانکەر، خوێناوی و، چاوەڕواننەکراو بێت و زۆرترین کاولکـاری و قوربـانی لـەدوای خـۆی جێبهێڵێـت. تـاوەکو بتـوانن سـەرنجی دەوروبـەر و جیهـان بـۆ لای خۆیـان و کێشەکەیان ڕابکێشن و، زۆرترین ڕووبەر لە چاپەمەنیەکاندا داگیر بکەن بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی زۆرترین ڕادەی دڵەڕاوکێ و نیگەرانی لە دڵ و دەروونی خەڵکدا، چونکە گەر وا ڕەفتار نەکەن، ئەوا دەسەڵات و دەست ڕۆیشتوویی خۆیان لەدەست دەدەن.

### تیرۆریزم چییە؟

دەسـتەواژەی تـیرۆر بـۆ یەکـەمجار لـە فەرەنـسا بـەکارهێنرا بـۆ باسـکردن و وەسفکردنی سیستەمێکی نوێی حکوومەت، کـە لەسـەروبەندی شـۆڕی فەڕەنـسی (١٧٨٩ ـ ١٧٩٩) بنیات نرا.

ڕژێمی تیرۆر بە نیازی گەشەپێدانی دیموکراسی و چەسپاندنی حوکمی گـەل بـوو لە ڕێی لەناوبردن و بنبڕکردنی دوژمنەکانی شۆڕش و پاککردنەوەی شۆڕش لە نەیار و ناحەزەکانی. هەرچۆنێك بێت ئەو سـەرکوتکاری و داپڵۆسـینانەی پیـادەکرا، لـە دواییدا گۆڕا بۆ ئامرازێکی سەرکوتکردن بە دەستی دەوڵەتەوە. کە هەر لەوکاتـەوە تیرۆر مانایەکی تەواو پێچەوانەی وەرگرتـووە لـەو مانایـەی کـە لـەو سـەردەمەدا باوبوو. هەرچۆنێك بێت وشەکە بە شێوەیەکی بەربڵاو بەکار نەهێنرا تـاکو سـەدەی نۆزدەهـەم کاتێـك لەلایـەن گروپێکـی شۆڕشـگێڕی ڕووسـییەوە بـە کـارهێنرا بـۆ وەسفکردنی ئەو چالاکییانەی کە دژ بە حوکمی تزارییەکان ئەنجامیان دەدا.

## تیرۆریزم وەك ڕەفتارێكی سیاسی

تیرۆر بەسروشت چالاكییەكی سیاسییە، چونكە ئەم چالاكییە هەوڵی بەدەستهێنان و بەكارهێنانی دەسەڵات دەدا لە پێناو ملكەچپێكردنی كەسانی دیكە بۆ داواكارییە تیرۆریستییەكان. كاتێك هەواڵی هێرشێكی تیرۆریستی لە ڕۆژنامە و دەزگاكانی ڕاگەیاندن بڵاودەبێتەوە، ڕاستەوخۆ سەرنجەكان بۆ ئەو ڕێكخراوە دەچن كە لە هێرشەكە بەرپرسیارە، ئەمەش لە بنەڕەتدا بەئامانجی بەدیهێنانی ئەو دەسەڵاتەیە كە پێشتر ئاماژەمان بۆكرد.

هەروەها ئەمە دەبێتە هۆی پەرەپێدانی ئەو بارو دۆخەی كە تیایدا ترس و دڵە ڕاوكێ زاڵ دەبێت و تیرۆریستانیش دەتوانن كاریگەر بن. لە دەرەنجامدا، باشترین پێوەر بۆ سەركەوتنی تیرۆر ئەوەیە كە تا چەند توانیویەتی سەرنج بۆ تیرۆریستان و كێشەكانیان راكێشێت، هەروەها تا چ ئەندازەیەك كاریگەریی دەروونی لەسەر نەتەوەیەك و هاوڵاتیانی ئەو نەتەوەیە بەجێ دەهێڵێت. تیرۆر لەم ڕووەوە جیاوازە لەگەڵ چالاكییە جەنگییەكان، كە پێوەری سەركەوتن تیایدا قەوارەی ئەو كەلوپەلە سەربازییانەیە كە تێكدەشكێنرێت و، ئەو ناوچە و هەرێمانەیە كە داگیر دەكرێن و، ژمارەی ئەو كوژراوانەیە كە لە ڕیزەكانی دوژمندا لەناو دەچن.

تیرۆریستان هەمیشە ئەوە دەكەنە پاساوی پەنا بردنە بەر توندوتیژی كە گوایە ئەوان هەموو چالاكییە سیاسییە ڕەواكانیان لێ قەدەغەكراوە و تیرۆر تاكە ڕێگاچارەیە كە بیگرنەبەر. ئەگەر چی ئەوان بە دوودڵییەوە یاخود پەشیمانییەوە ئەو ڕێگایەیان هەڵبژاردووە.

ئایا تا چەند ئەم پاساوە ڕاست و دروستە؟ ئەوە دەوەستێتە سەر ئەوەی ئایا ئێمە هاوسۆزین لەگەڵ كێشەی تیرۆریستاندا یاخود هاوسۆزین لەگەڵ قوربانییەكانی تیرۆریستان، بە چەشنێك ئەوەی بەلای هەندێك كەسەوە بە تیرۆریست دادەنرێت،



هەندێ كەسی دیكە بە جەنگاوەری ئازادی لە قەڵەمی دەدەن. لە هەمانكاتدا كردارە تیرۆریستییەكان كوشتن و لە ناوبردن و ڕفاندن و تەقاندنەوە و ئاگر تێبەردانیش دەگرێتەوە، كە بۆ ماوەیەكی درێژ لەلایەن هەردوو یاسای ناوخۆیی و نێودەوڵەتییەوە وەكو تاوان پێناسە كراون. تەنانەت لە كاتی جەنگیشدا ئەو توندوتیژییەی بە ئەنقەست لە دژی هاوڵاتیانی بێ تاوان ئەنجام دەدرێت بە تاوان دەژمێردرێت.

## پێناسەی حكومەتەكان بۆ تیرۆریزم

هەرچەندە جیاوازی لە چۆنیەتی پێناسەكردنی تیرۆردا هەیە، بەڵام پەرلەمانی زۆرێك لە وڵاتان تیرۆریان وەكو تاوان ناساندووە، بۆ نموونە لە بەریتانیا یاسای كرداری تیرۆریستی بەم شێوەیە پێناسەی تیرۆر دەكات: ((ئەنجامدانی كردارێك، یاخود هەڕەشەی ئەنجامدانی كردارێكە بە ئامانجی كاركردنە سەر حكوومەت، یان ترساندنی جەماوەر بە گشتی یان بەشێك لەو جەماوەرەیە، لە پێناو هێنانەدی ئامانجێكی سیاسی، ئایدۆلۆژی، ئایینی....هتد)).

سیستەمی یاساكانی بەریتانیا كاریگەری بەسەر یاساكانی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و كەنەدا و ئیسرائیلەوە هەیە. یاسای فیدراڵی ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا پێناسەی تیرۆر دەكات بەوەی كە بریتییە لە كردارە توندوتیژەكان یان كردارە مەترسیدارەكان كە هەڕەشەن بۆ سەر ژیانی مرۆڤەكان، كەوا دیارە بۆ مەبەستی ترساندن و ناچاركردنی هاوڵاتیان ئەنجام درابێت تا بەو هۆیەوە كاریگەری بخەنە سەر سیاسەتی حكوومەت لە ڕێگەی ترساندن و تۆقاندنەوە، یاخود بۆ ئەوەی هەڵسوكەوتی حكوومەت بگۆڕن لە ڕێگای كوشتن و لەناوبردنەوە.

هەروەها یاسای دژە تیرۆری کەنەدی، چالاکی تیرۆریستی بەم شێوەیە دەخاتە ڕوو: ((بریتییە لەو کردارەی لە بەشێك یاخود سەرتاسەری ولاّتدا ئەنجامدەدرێت بۆ مەبەستێکی یان هۆکارێکی ئایدۆلۆژی، ئایینی، یاخود سیاسی بە نیازی شپرزەکردنی ژیانی هاولاّتیان لە ڕێگەی تێکدانی ئارامی و ئاسایشەوە. یاخود بە فشار خستنە سەر کەسێك، حکومەتێك، یان ڕێکخراوێکی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی بۆ ئەوەی چالاکییەکی دیاریکراو ئەنجام نەدات جا ئەو کەسە ڕێکخراو یان حکومەت لەناوەوە یاخود لە دەرەوەی کەنەدا بێت)). یاسای ئیسرائیلی پێناسەیەکی دیاریکراوی بۆ تیرۆر نەکردووە، بەلاّم لە یاسای قەدەغەکردنی تیرۆری ژمارە (٣٣) دا ڕێکخراوی تیرۆریستی بەم شێوەیە پێناسە کردووە: ((قەوارەیەکە، چالاکییەکانی خۆی لە کرداری توندوتیژ و زەبروزەنگدا چڕکردۆتەوە بۆ کوشتن و بریندارکردن، یان هەڕەشەی بەکارهێنانی ئەم کردارە توندوتیژانە دەکات)).

## هۆکارەکانی تیرۆر

سەرهەڵدان و بەردەوامبوونی تیرۆر بۆ چەندین هۆکاری جۆراو جۆر دەگەڕێتەوە، وەك هۆکاری ئابووری، سیاسی، مێژوویی، کۆمەلاّیەتی، کولتووری یان ئایینی، یان کۆبوونەوەی هەندێك لەو هۆکارانە بەسەر یەکەوە ڕۆڵیان هەیە لە دروستبوون و مانەوەی تیرۆر.

هەندێك لە دەوڵەتان لە سەردەمێکی دیاریکراودا بە دەستی تیرۆر ناڵاندوویانە، وەکو ئیتالیا و ئەڵمانیای ڕۆژهەلاّت لە دەوری سالاّنی حەفتاکاندا. تیرۆری توندوتیژانە بۆ چەند دەیەیەك لەم ولاّتانەدا بە شێوەیەکی بەرچاو بەرەو هەڵکشان چووە پێش ئەوەی بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش بەرەو کزی و لاوازی بچێت. هەندێ



لە ولاّتانی دیکە، وەکو کەنەدا چەند ڕووداوێکی بچووك و پچڕپچڕی تیرۆریستی بەخۆوە بینیوە.

بە شێوەیەکی گشتی ولاّتە دیموکراتییەکان زەمینەیەکی لەبار بۆ تیرۆر دەڕەخسێنن بەهۆی سروشتی کراوەیی ئەم کۆمەڵگایانە، کە تیایاندا هاولاّتیان خاوەنی چەند مافێکی بنەڕەتین، وەك ئازادی مەدەنی و پاراستنی یاسایی. هەروەها چاودێری و جڵەوکردنی حکومەت لەسەر بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتکردنی هاولاّتیان لەم کۆمەڵگایانەدا بوونی نییە، بەلاّم لە کۆمەڵگا سەرکوتکەرەکاندا کە تیایاندا حکومەت لە نزیکەوە چاودێری هاولاّتیان دەکەن و فشارێکی زۆریان دەخەنە سەر، کەشێکی سەخت بۆ تیرۆریستان سازدەبێت، ئەگەرچی هەندێ جار سیاسەتی حکومەتەکە سیاسەتێکی تیرۆریستانە نییە، ئەمە سەرەڕای بەر تەسککردنەوەی ئازادییە مەدەنییەکان و قەدەغەکردنی ئازادی ڕادەربڕین و کۆڕ و کۆبوونەوە، هەروەك لە ڕۆژگاری حوکمڕانی تزارییەکان لە ڕووسیا و سەردەمی حوکمی کۆمۆنیستی کۆمارە سۆشیالیستەکانی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو بەرچاو دەکەوت و ئێستاش لە کۆماری میللی چین و میانمار و لاوسدا بەرچاو دەکەوێت.

بە مانایەکی بەرفراوانتر ئەو هۆکارانە بەشێوەیەکی بەرچاو خەڵکیان ناچارکردووە تا بیرو هۆشیان بە تیرۆرەوە سەرقاڵ بکەن، ئەو ناعەدالەتی و نادادپەروەرییەی کە لەئەنجامی سەرکوتکردنی سیاسی، بارودۆخی خراپی ئابووری، جیاکاری ڕەگەزی، چەوساندنەوەی ئایینی دەکەوێتەوە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو نایەکسانییەی لە دابەشکردنی دەسەلاّت و سەروەت و ساماندا هەیە، تیرۆریستان هەوڵی لادانی ئەو حکومەتانە دەدەن کە بەشێوەیەکی دیموکراسی هەڵبژێردراون. لەسالاّنی شەست و حەفتاکاندا گروپە تیرۆریستە چەپڕەوەکان بە هەندێ ئامانجی دیاریکراوەوە کاریان دەکرد، تا بە بۆچوونی خۆیان کۆمەڵگایەکی یەکسان بنیات

بنێن و بیکەن بە کۆمەڵگایەکی کۆمۆنیستی، چەکدارانی بادەر مینهۆفی ئەڵمانی و سوپای سووری ئیتالی بەشێك بوون لەم گروپانە.

هەندێك گروپی دیکەی تیرۆریستی پێیانوابوو بە ئەرکێك هەڵدەستن کە لە لایەن خواوە فەرمانیان پێکراوە یان لە ئاسمانەوە ئیلهامیان پێبەخشراوە. کۆمەڵەی (ئوم)ی ئایینیش لە یابان بەرپرسیار بوو لە هێرشکردنە سەر میترۆیەك لە وڵاتی یابان لە ساڵی ١٩٩٥ بە بەکارهێنانی گازی ژەهراوی کە تیایدا ١٢ کەس بوونە قوربانی.

بە ڕەچاوکردنی جیاوازییەکانیان هەندێك لەو گروپانە کۆمەڵێك ئامانجی بەرفراوانتر و گرینگتریان هەیە، وەك دووبارە بنیاتنانەوەی وڵاتی نەتەوەیەك، وەکو جیاخوازەکانی هەرێمی باسك لە ئیسپانیا. یاخود ئامانجەکەیان دەبێتە یەکخستن و یەکگرتنەوەی گەلێکی پارچە پارچەکراو، کە لە ئامانجی ناسیۆنالیستی ئێرلەندییەکان لە ئێرلەندای باکوور بەدی دەکرێت.

لە کۆتاییدا، هەندێ لە تیرۆریستان چەند کێشەیەکی دیاریکراو دەبنە پاڵنەریان بۆ کارە تیرۆریستییەکان، وەك بەرهەڵستیکردنی یاسای لەباربردنی منداڵ، یاخود بەرگریکردن لە ژینگە و مافی ئاژەڵان. ئەوان بە هیوان فشار بخەنە سەر حکوومەت و ڕای گشتی تاکو داواکارییەکانیان لە یاسادا ڕەنگ بداتەوە.

چالاکەکانی بواری بەرگریکردن لە مافی ئاژەڵ لە هەڵمەتەکانیاندا بۆ ڕاگرتنی تاقیکردنەوە پزیشکییەکان لەسەر ئاژەڵان توندوتیژی دژی زانایان و تاقیگەکان بەکاردەهێنن. بەرگریکارانی ژینگە زۆرێك لە پرۆسەکانی تێکدان و لەناوبردنی پایەکانی دەسەڵاتیان ئەنجامدا، بۆ ناڕەزایی دەربڕین دژی پیسکردن و تێکدانی ناوچەگەلێکی بەرفراوانی سروشت.



ئەو توندڕەوانەی بەرهەڵستی یاسای ڕێگەدان بە لەباربردنی منداڵ بوون هێرشیان کردە سەر بنکە تەندروستییەکان و هەڵسان بە کوشتنی ئەو پزیشك و کارمەندانەی لەو بنکانەدا کاریان دەکرد کە پرۆسەی منداڵ لەباربردنیان تیادا بەڕێوەدەبرا، بە ئامانجی ئەوەی مافی لەباربردنی منداڵ بەژنان ڕەوا نەبینن.

هەندێك لە حکوومەتان بۆ هێنانەدی ئامانجە سیاسییەکانی دەرەوەیان کە پێیان دەوترێت حکوومەتە لەیاسا دەرچووەکان پشتگیری تیرۆریستان دەکەن.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم جیاوازییانە حکوومەتە لە یاسا دەرچووەکان جۆرێك لە جەنگی نهێنی بەڕێوە دەبەن کە تیایدا حکوومەتان لە ڕێی پشتگیریکردن و پاڵپشتی کردنی تیرۆرەوە درێژە بەم جەنگە نهێنییە دەدەن.

دەسەڵاتدارانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە ڕەسمی ئەو دەوڵەتانە دەخاتە لیستی دەوڵەتانی هاریکاری تیرۆر کە بەشێوەیەکی چالاك هاوکاری و پشتگیری تیرۆریستان دەکەن و، ئەوانەی داڵدەی تیرۆریستانیان داوە، ئەوانەی ئامادەنین دەست لە تیرۆر هەڵگرن وەك ئامرازێکی سیاسی.

هاوکاری ئەو حکوومەتانە بۆ ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان لەشێوەی دابینکردنی پارەوپوڵ و خەرجی و جێگەو زامنکردنی ڕێگەی گواستنەوەو هاتوچۆ بۆ تیرۆریستان کە بەم شێوەیە دەتوانن ڕێکخراوێکی بێ سەنگ و لاواز بگۆڕن بۆ ڕێکخراوێکی کاریگەری مەترسیدار.

دەسەڵاتدارانی ئیدارەی ئەمریکی هەندێك لە وڵاتانیان خستۆتە لیستی وڵاتە لە یاسا دەرچووەکان یان وڵاتانی هاریکاری تیرۆر، وەك ئێران، سوریا، سودان و، کۆریای باکوور. لەم لیستەدا ئێران وەك وڵاتێکی چالاك ناوی هاتووە لە بواری هاوکاریکردنی تیرۆردا چونکە هاوکاری و یارمەتییەکی زۆر پێشکەش بە گروپەکانی وەك (حزب اللە)ی لوبنانی و حەماس و جیهادی ئیسلامی فەلەستین

دەكات، هەرچەندە حكوومەتی پێشووی ئەفغانستان پشتگیری بێ ئەندازەی رێكخراوی قاعیدەی دەكرد بە سەركردایەتی ئوسامە بن لادن، بەڵام ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا ئەو وڵاتەی لە لیستی وڵاتانی هاوكاری تیرۆر دانەنابوو، چونكە حكوومەتی تاڵیبانی بە حكوومەتێكی شەرعی لەقەڵەم نەدەدا.

## زیادبوونی ئاست و سنووری هێرشە تیرۆریستییەكان

هەرچەندە رووداو و كارە تیرۆریستییەكان لە سەرانسەری جیهاندا و لەماوەی ساڵانی نەوەتەكاندا بەرەو كەمبوونەوە چوون، بەڵام ژمارەی ئەو قوربانییانەی كە لەو رووداوە تیرۆریستییانەدا كەوتوونەتەوە زیادی كردووە. واتە لە كاتێكدا تیرۆریستان چالاكییەكی كەم ئەنجام دەدەن، بەڵام بەشێوەیەكی كاریگەرانە و مەترسیدار كردارەكانیان كاولكاری و كوشتوبڕ لەدوای خۆی بەجێ دەهێڵێ. هۆكاری بنەڕەتی و سەرەكی بۆ باڵادەستبوونی ئەم جۆرە تیرۆرە، ئەو پاڵنەرە نامرۆڤانەیە كە لەپشت ئەو رووداوانەوەیە، هەروەك لە هێرشەكانی سەر بنكەی بازرگانی نێودەوڵەتی لە نیویۆرك و پنتاگۆن و ڤێرجینیا لە ١١ ی سێپتێمبەری (٢٠٠١)دا دەركەوت. لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەو تیرۆرەی پاڵنەرێكی ئایینی لەپشتەوە بێت، سەردەكێشێت بۆ توندوتیژییەكی خوێناویتر و وێرانكەر تر، وەك ئەو توندوتیژییەی گروپە ئایینییەكان پیادەی دەكەن.

یەكێكی تر لەو هۆكارە سەرەكییانەی كە رۆڵیان لە زیادكردنی ئاست و سنووری هێرشە تیرۆریستییەكاندا بینیوە ئەوەیە كە تیرۆریستان هەوڵیان بۆ رەخساوە جۆرەها چەك بەكار بهێنن، هەر لە چەكی ئاساییەوە تا بەو چەكانە دەگات كە تەكنەلۆژیای بەرزیان دەوێت.



بۆ زیاتر لە سەدەیەك تیرۆریستان پشتیان بەو بۆمب و چەكانەوە دەبەست كە دەستیان پێ رادەگەیشت. دەربارەی ئەو چەكانەی كە تەكنەلۆژیای بەرزیان گەرەكە، بەڵگەی ئەوە هەیە كە رێكخراوی قاعیدە لە هەوڵی بەدەستهێنانی چەكی كیمیای و بایەلۆژی دایە، تەنانەت رێكخراوی (ئوم) ی یابانیش بەم چەكە لە ساڵی ١٩٩٥ دا هێرشێكی تیرۆریستی ئەنجامدا. ئێستا مەترسی ئەوە هەیە كە ئەو عەمبارە چەكە گەورانەی لە دوای رووخانی یەكێتی سۆڤیەتی جارانەوە بە جێماوە، تیرۆریستان بتوانن لە بازاڕی رەشدا دەستیان كەوێت و بیكڕنەوە.

زیادبوونی هێرشە خۆكوژییەكان پەیوەندی بە زیادبوونی ژمارەی قوربانییەكانی كردارە تیرۆریستییەكانەوە هەیە. پەلامارە خۆكوژییەكان لە كردە تیرۆریستییەكانی دیكە جیاوازە، چونكە تیاچوونی كەسی خۆكوژ پێوەری سەركەوتنی پەلامارەكەیە، واتە كەسی خۆكوژ بە پاڵنەرێكی بەهێزەوە و بە هەست و باوەڕێكی پتەوەوە خۆبەخشانە یان لەرێی قەناعەت پێكردنەوە دەست لەژیانی خۆی هەڵدەگرێت و كۆتایی بەژیانی خۆی دەهێنێت. شەپۆلی پەلامارە خۆكوژییەكان لەساڵی ١٩٨١ لە بەیروت دەستی پێكرد، كاتێك گروپێك بەناوی ئەلدەوا ئۆتۆمبێلێكی مینرێژكراویان بەكارهێنا بۆ تەقاندنەوەی باڵیۆزخانەی عێراق، ئەلدەوا رێكخراوێكی تیرۆریستی بوو، پێكهاتبوون لە شیعەكانی سەر بە ئێران، ئەم پەلامارە بووە مایەی كوشتنی ٦١ هاوڵاتی و بریندار كردنی زیاتر لە ١٠٠ كەس. لە ساڵی ١٩٨٣، بارهەڵگرێكی پڕ لە تەقەمەنی بۆ تەقاندنەوەی باڵیۆزخانەی ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا بە كارهێنرا، كە كوژرانی ٤٩ كەس و برینداربوونی ١٢٠ كەسی لێكەوتەوە. كە بەدوایدا هێرشێكی تری خۆكوژی كرایە سەر بنكەیەكی سەربازی ئەمریكی كە ٢٤١ كەسی تیا كوژراو گروپێك بەناوی جیهادی ئیسلامی بەرپرسیارێتی خۆی لەم كارەدا راگەیاند.

لە ساڵی ١٩٩٤یشدا هێرشێکی خۆکوژی مەڵبەندێکی کۆبوونەوەی جولەکەکانی لە پایتەختی ئەرجەنتین لە بۆینس ئایرس وێران کرد و بووە هۆی کوژرانی ٩٦ کەس. بەم دواییانەش هێرشە خۆکوژییەکانی ڕێکخراوی قاعیدە بۆ سەر هەردوو باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە کینیا و تەنزانیا لە ساڵی ١٩٩٨ نزیکەی ٣٠٠ کوژراوی بە دوای خۆی بەجێهێشت. هەروەها پەلامارە تیرۆریستییەکانی سەر بنکەی بازرگانی نێودەوڵەتی لە نیۆیۆرك و وەزارەتی بەرگری (پنتاگۆن) لە ساڵی ٢٠٠١دا بووە مایەی کوژرانی نزیکەی ٣٠٠٠ کەس.

تیرۆریستانی ئەمڕۆ مەبەست و ئامانجەکانیان کەمتر ڕوون دەکەنەوە هەروەك ئەوەی تیرۆریستانی پێشوو دەیانکرد، ئەم ڕاستییەش ڕەنگدانەوەی لەسەر مەترسیداربوون و خەتەرناکی کردارە تیرۆریستییەکان هەیە، پێشتر تیرۆریستان نەك هەر بەیاننامەی ڕەسمیان بڵاودەکردەوە، بەڵکو هۆکاری کردەوەکانیان تیا ڕوون دەکردەوە و بە شانازیی و خۆ هەڵکێشانیشەوە باسیان دەکرد. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە پێدەچێ توندوتیژی تەنها لە پێناوی توندوتیژی ئەنجام بدرێت. لە لایەکی دیکەوە تیرۆریستانی ئەمڕۆ توندوتیژی وەك تۆڵەکردنەوە یان سزایەك پیادە دەکەن زیاتر لەوەی ئامرازێك بێت بۆ هێنانە ئارای گۆڕانکاری سیاسی. کەواتە کەمتر پێویستیان بە پاساوهێنانەوە دەبێت بۆ لایەنگران و خەڵکانی دەرەوەی گروپەکە.

## خەسڵەتەکانی پەلامارە تیرۆیستییەکان

هەموو تیرۆریستان یەك خەسڵەتی هاوبەشیان هەیە کە هەرگیز هیچ کردەوەیەك ڕەمەکیانە و بی پلاندانان ئەنجام نادەن. هەموو تیرۆریستێك دەیەوێت ڕاگەیاندن بەخۆیەوە سەرقاڵ بکات، چونکە ڕاگەیاندن یارمەتی تیرۆریستان دەدات لە



باڵادەستکردنی کەشی ترس و تۆقاندن کە بۆ سەرکەوتنی ئەوان پێویستە. بەو پێیە هەموو کردەیەکی تیرۆریستی بە وریایی و وردبینییەوە نەخشەی بۆ دەکێشرێت، بۆ نموونە کردەوەی تیرۆریستی دژی باڵیۆزخانەکانی ئەمریکا لە کینیاو تنزانیا لە ساڵی ١٩٩٨دا، دەرکەوت کە ڕێکخراوی قاعیدە نزیکەی پێنج ساڵ بوو سەرقاڵی نەخشەکێشانی ئەو پەلامارە بوو.

چەند ڕەگەزێکی سەرەکی پێویستن بۆ نەخشەدانانی کارێکی تیرۆریستی، وەك کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری لەسەر ئامانجە تیرۆریستییەکە. لە هەمانکاتدا دابینکردنی پشتگیری لۆجیستی و زامنکردنی جێبەجێکردنی ئەرکەکان. ئەم ئەرکانەش دابینکردنی چەك و کەلوپەلی پەیوەندیکردن دەگرێتەخۆ کە پێویستن بۆ سەرکەوتنی کردەکە. هەروەها ئامادەکردنی حەشارگە و، ڕێو شوێنی گواستنەوە بۆ گروپە تیرۆریستییە هێرشبەرەکە و، دابینکردنی ڕێگای دەرچوون و دەربازبوون بەشێکن لە نەخشە تیرۆریستییەکە.

هەموو گروپە تیرۆریستییەکان لە خەسڵەتێکی دیکەی بنەڕەتیدا هاوبەشن، ئەویش ئەوەیە کە نهێنین و دوورن لە چاودێری دەسەڵات و چاوی بەکرێگیراوان و کارمەندانی دەزگا هەواڵگرییەکان لە ناو خەڵکدا. بۆ پاراستنی ئەو نهێنییە، گروپە تیرۆریستییەکان بەزۆری بە شێوەی چەند شانەیەك خۆیان ڕێکدەخەن کە تیایدا هەموو شانەیەك سەربەخۆیە لە شانەکانی دیکە، بەڵام هاوکاری و هەماهەنگی لە نێوانیاندا هەیە، لەوانەیە شانەیەکی تیرۆریستی ئەوەندە بچووك بێت کە لە دوو ئەندام یان سێ ئەندام پێکهاتبێ، تیایاندا تەنها ئەندامێك یان ئەندامانی سەربە شانەیەکی دیکە دەناسن.

هەر لەبەر ئەم هۆیەشە تیرۆریستان ئەم شێوە ڕێکخستنە پەیڕەو دەکەن کە پەیکەرێکی هەرەمی هەیە، هەروەکو لەو گروپانەدا دەردەکەوێت کە بونیادی سەرکردایەتی لەسەرەوە بۆ خوارەوەی هەیە.

## ئامانجەکانی تیرۆر

هاوڵاتیانی مەدەنی، زۆرترین ڕێژە لە ئامانجە تیرۆریستییەکان پێکدەهێنن، کە بووەتە مایەی دروستبوونی کەشێکی تۆقێن و ترسناك لە نێو کۆمەڵگەدا. هەندێك لە تیرۆریستان بە ئەنقەست لە هێرشەکانیاندا، ژمارەیەکی گەورە لە هاوڵاتیانی مەدنی دەکەنە ئامانج، بەڵام زۆربەی هێرشە تیرۆریستییەکان، کەسانی دیپلۆماسی و دەزگا دیپلۆماسییەکانی وەك باڵیۆزخانە و فەرمانگەو بنکە سەربازییەکان بە ئامانجی خۆیان هەڵدەبژێرن. جگە لەمانە دەزگا کارگێڕی و فەرمانگە هاوکارییەکانی وەك هۆکارەکانی گواستنەوە، کە هێڵی ئاسمانی و، فڕۆکەخانە و شەمەندەفەر و، وێستگەکانیان و، پاس و، تۆنێڵەکان دەگرێتەوە، لەم هێرشانە بێ بەش نەبوون.

تیرۆریستان لە پێکانی ئامانجە نازیندووەکانی وەك باڵەخانە و شوێنەکانی دیکە مەبەستێکیان هەیە، لەم کارانەیاندا زیاتر دەیانەوێ سەرنجی گشتیی بۆ تیرۆریستان و کێشەکانیان ڕابکێشن لەوەی کە بەتەواوی وێرانکاری ئەنجام بدەن یان خەڵك بکوژن، هەرچەند وێرانکاری و کوشتن دەرەنجامی دوایی ئەم کردانەن.

لەگەڵ ئەوەی کە ژمارەی هێرشە تیرۆریستییەکان لەساڵێکەوە بۆ ساڵێکی دیکە جیاوازە، بەڵام ڕاستییەك لە جیهانی تیرۆردا بە چەسپاوی ماوەتەوە کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا تا ئێستا بووەتە زۆرترین ئامانجی تیرۆریستان. لە



ساڵی ١٩٦٨ ەوە، وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەمیشە لە پێشەوەی لیستی ئەو وڵاتانەوە بووە کە هاوڵاتیانی بەرەنگاری مەترسی کردە تیرۆریستییەکان بوونەتەوە.

جگە لەوەی کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا گەورەترین دەسەڵاتداری جیهان و ڕابەری وڵاتانی ئازادە، چەند هۆکارێکی دیکەش لەدواوەی ئەم دیاردەیەوە هەن، کە بواری جوگرافی و، جۆراوجۆری بەرژەوەندی بازاڕی ئەمریکی لە دەریا و، زۆری ژمارەی گەشتیاران و ئەوانەی لە دەرەوەی وڵاتدا کاردەکەن و، بڵاوبوونەوەی بنکە سەربازییەکانی ئەم وڵاتە بە ڕێژەیەکی زۆر لە وڵاتانی جیهاندا، دەگرێتەوە.

## داواکاری تیرۆریستان

داواکاری تیرۆریستان لە نێوان پرۆژەی گەورەی وەك بنیاتنانەوەی کۆمەڵگا بە درێژایی هێڵە ئایدۆلۆژییەکان، بۆ ئامانجی دووری بەر تەسکتر، وەك ئازادکردنی بارمتە لەپێناو پارە و بڵاوکردنەوەی چاپەمەنییەکان کە بانگهێشتە بۆ ئامانجی تیرۆریستی دەکات، درێژ بۆتەوە. لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، گروپی مارکسیست ـ لینینست ی وەك گروپی بادەر مینهۆف (کە دواتر ناویان بۆ دەستەی بەرهەڵستکاری سوپای سوور گۆڕا) لە ئەڵمانیا و، لیوای سوور لە ئیتاڵیا، دەستیان بە ئەنجامدانی هەڵمەتێك کرد لە پێناو بنیاتنانەوەی کۆمەڵگا بەرەو هێڵەکانی کۆمۆنیست. بەڵام گروپە ئیسلامییە تیرۆریستەکان لە تەقەلا دابوون بۆ بەرجەستکردنی حوکمی ئایینی توندڕەوی تیۆکراسی (حوکمی دەوڵەت لە ژێر ڕێنمونی خوداوەند)، کە بریتی بوون لە ڕێکخراوی قاعیدەی ئوسامە بن لادن و گروپی ئەبو سەیاف لە فلیپین و گروپی چەکداری ئیسلامی لە جەزائیر. ئامانجی هەندێ گروپی دیکەی تیرۆریستی لە چوارچێوەیەکی بەرتەسکتردا خۆی دەبینێتەوە، وەك دامەزراندنەوەی وڵاتێکی نەتەوەیی لە نێو ئەو وڵاتەی کە تێیدا دەژین،

نموونەشیان بزووتنەوەی جوداخوازەکانی هەرێمی باسك لە ئیسپانیا. یان داوای یەکخستنەوەی گەلێکی دووبەشکراو دەکەن، کە لەلایەن ناسیۆنالیستە ئێرلەندییەکان لە ئێرلەندای باکوور خەباتی بۆ دەکرێت.

## کاریگەری تیرۆر

هەرچەندە گروپە تیرۆریستییەکان لە بەدەستهێنانی ئامانجە ستراتیژییەکانیان سەرکەوتوو نەبوون، بەڵام توانیویانە هەندێ گۆڕانکاری مەعنەوی سیاسی ئەنجام بدەن. لە هەندێك باردا تیرۆریستان لە ئازادکردنی بەندکراوەکانیان و، تەنازول پێکردنی حکوومەتە بەرهەڵستکراوەکانیان، یان لە وەدەستهێانی دەستکەوتی مەعنەوی، سەرکەوتووبوون، کە ئەگەر وانەبوایە لەوانەیە پشتگوێ دەخران.

هەر لەدوای جەنگی دووەمی جیهان کە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی و فەرەنسی لە وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا توایەوە، تیرۆر لە لایەن هەندێك بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی لە دژی کۆلۆنیالیستان پیادەکرا. وڵاتانی وەك ئیسرائیل، کینیا، قوبرس، جەزائیر سەربەخۆیی خۆیان بۆ بوونی ئەم بزووتنەوانە دەگەڕێننەوە.

نموونەکانی ئەم دواییەی (گێری ئادامس) و (مارتن ماکگیونیس) لە ئێرلەندا و، (یاسر عەرەفات) لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەڕوونی بەڵگەی سەرکەوتنی تیرۆریستانی تیادا دەردەکەوێت. ئادامس، سەرۆکی باڵی سیاسی ئێرلەندییە کۆمارییەکان (IRA) و جێگرەکەی ماکگیونیس، هەردووکیان لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٧ سەرکەوتنیان بەدەستهێنا بۆ پەرلەمانی بەریتانی. عەرەفاتیش، وەك سەرۆکی ڕێکخراوی ئازادیخوازی فەلەستینی (PLO)، توانی ڕێکخراوەکەی بە جیهان بناسێنێ. ئەمانە توانیان لە ڕێگەی سەرکەوتنی کاتی و دەستکەوتی



سیاسیی ڕێکخراوەکانیان ئەوە بسەلمێنن کە چۆن زنجیرە چالاکی تیرۆریستی دەتوانێ سەرنجی جیهان بۆ کێشەی هەمیشەییان ڕابکێشێ.

زۆربەی گروپە تیرۆریستییەکان نەیانتوانیوە هیچ لە ئامانجە درێژخایەن و کورتخایەنەکانیان بەدەست بهێنن، ئەمەش بەڕوونی لە ماوەی ژیانی گروپە تیرۆریستییە نوێکان بە دی دەکرێت. بەگوێرەی ئامارێك (٩٠٪) گروپە تیرۆریستییەکان تەمەنی پێشبینیکراویان کەمتر لە ساڵێکە.

تیرۆریستان، لە ئامانجە جەماوەرییەکانیاندا، نەخشە بۆ تۆقاندنی ئاسایشی تاك دادەڕێژن کە دەتوانن بنیاتی دەوڵەت بڕوخێنن لە ڕێگەی تێکدانی کارو ژیانی ڕۆشنبیری و ئەو باوەڕە هاوبەشەی کە کۆمەڵگەی لەسەر بنیاتنراوە. دڵنیا نەبوون لەبارەی ڕوودانی هێرشە تیرۆریستییەکان لە چ کات و شوێنێك، ترس و دڵەڕاوکێ لەلایەن خەڵك دروست دەکات، سەرەنجامی ئەمەش خەڵك ناتوانێت هاموشۆی بازاڕ و شوێنە گشتییەکان و... هتد، بکات.

بۆچوونی خەڵك لەمەڕ مەترسی تاك، هەرگیز لەگەڵ دوورییە تێبینیکراوەکانی هەڕەشەی تیرۆریستان ناگونجێت. بەگوێرەی ئامارێك کە نوسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی بڵاوی کردەوە، لەماوەی نێوان ١٩٦٨ ەوە تا ٢٠٠٠، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هەموو وڵاتانی دیکە زیاتر بووەتە ئامانجی تیرۆریستان کە نزیکەی ١٠٠٠ هاوڵاتی ئەمریکی چی لەدەرەوە یان لەناوەوەی وڵاتدا بوونەتە قوربانی کردە تیرۆریستییەکان. کەچی لە هێرشەکەی ١١ی سێپتێمبەری ٢٠٠١، سێ ئەوەندەی ئەو ژمارەیە بوونە قوربانی. ئەمە ڕاستییەك دەردەخات کە درککردن بە کردە تیرۆریستییەکان هیچ نرخێك نادات بوونە قوربانی. لەگەڵ ئەوەشدا توانای تیرۆریستان بۆ خوڵقاندنی ترس و نانەوەی پەشێوی بەڵگەیە بۆ کاریگەری ئەوان لەسەر ژیانی ڕۆژانەمان.

بەگوێرەی سەرچاوە ڕەسمییەکانی حکوومەتی کەنەدا، هیچ لیستێکی باوەڕپێکراو نییە بۆ بوونی ڕووداوی تیرۆریستی لەم وڵاتەدا. بەڵام بە پێی ئامارێکی ڕەسمی کە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بڵاو کرایەوە، ژمارەی ئەو کەنەدیانەی کە لە ساڵی ١٩٦٨ەوە کوژراون، بە ٢٩٤ کەس دەخەملێنێ. لەم ژمارەیەدا ٢٧٩ هاوڵاتی کەنەدی لە کۆی ٣٧٩ کەسی دیکە لە ئەنجامی تەقینەوەی فڕۆکەیەك لە ساڵی ١٩٨٥ کە لە ڕێگەیدا لە مونتریال ـ کیوبیك، بۆ لەندەن دەچوو، بوونە قوربانی.

## دژە تیرۆر

دەسەڵاتی یاسایی حکوومەتان لەسەر دژە تیرۆر:

**١ـ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:**

وەزارەتی ئاسایشی نیشتمانی (DHS) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە ساڵی ٢٠٠٢ بە هۆی یاسای ئاسایشی نیشتمانی دروستبوو، دەزگای بەرپرسی سەرەکییە لە تەقەلاکانی حکوومەتی ئەمەریکا بۆ نەهێشتن و بەرپەرچدانەوەی تیرۆر. دروستبوونی ئەم وەزارەتە بەهۆی ئەو ڕەخنە و تێبینیانەوە بوو کە چۆن حکوومەتی ئەمەریکا خۆی ڕێکخستووە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشە تیرۆریستییەکان. یاساکە دوانزە دەزگای حکومی لەم وەزارەتەدا یەکخستووە کە هەمان بەرپرسیارێتی لە نەهێشتن و بەرپەرچدانەوەی تیرۆر دەگرنە ئەستۆ. لەم دەزگایانەش: (پاسەوانانی کەنار، هێڵی نەوت، خزمەتگوزاری کۆچ و ڕەگەزنامە، بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گواستنەوە). دواتر دەزگای بەڕێوەبردنی فریاگوزاری فیدراڵی (FEMA) بۆ ئەم بەشە گواسترایەوە بۆ ئەوەی لە بەرەنگاربوونەوەی کردە تیرۆریستییەکاندا هاوکاری بکات.



هەرچەندە (DHS) زۆربەی دەزگاکانی دژە تیرۆری حکومی یەکخست، بەڵام هەندێکیان لە دەرەوەی ئەم بەشەدا مانەوە، وەك دەزگای جێبەجێکردنی گەورەترین یاسای نەتەوەکان و نوسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی (FBI) کە ئەمەی دوایی بەرپرسیارێتی لێکۆڵینەوەی کارە تیرۆریستییەکانی کەوتە ئەستۆ.کەچی دەزگای موخابەراتی ناوەندی (CIA) زانیاری دەربارەی تیرۆر لە وڵاتانی بیانی کۆدەکاتەوە. دەزگاکانی دیکەی حکوومەت کە پەیوەندارن بە پرۆسەی دژە تیرۆر، وەزارەتەکانی (ڕاگەیاندن، بەرگری، داد، تەندروستی، هاوکاری و مرۆڤایەتی، گواستنەوە، کشتوکاڵ، بازرگانی، دارایی، ئاگرکوژێنەوە، تەقینەوە، ناوەکی، پاراستنی ژینگە) دەگرێتەوە

**٢- کەنەدا:**

ـ دەزگای موخابەراتی ئاسایشی کەنەدی (CSIS) سەرەکیترین دەزگایە کە بەرپرسیاریەتی ئاسایش و موخابەرات (دژە تیرۆر) لە کەنەدا دەگرێتە ئەستۆ. ساڵی ١٩٨٤ لەمیانەی ئەو گرنگیانەی کە حکوومەتی کەنەدا لە بواری هێزی چاودێری بە (CSIS) یدا، دەزگایەکی دیکەی دامەزراند کە بەرپرسیارێتی سەرەکی کارکردنە وەك دەزگایەکی سەربەخۆ بۆ لێکۆڵینەوە لەو ڕەخنە و گازاندانەی کە ئاراستەی (CSIS) دەکرێن.

- فەرمانگەی گشتی پارێزەران چاودێری ڕەوشی بەرەوپێشچوونی فڕۆکەخانەکان دەکات لەپێناو باشترکردنی جێبەجێکارییەکانی تەکنۆلۆژیا تیایاندا، کە بە مەبەستی دژە تیرۆر پەرەی پێدەدرێت.

ـ پۆلیسی پاشایەتی کەنەدی دەزگایەکی دیکەیە کە بۆ جێبەجێکردنی یاسای نیشتمانی لە کەنەدا کاردەکات و، هێز و توانای بەدواداچوون و دەستبەسەراگرتنی ئەو بەڵگەنامانەی هەیە، کە پەیوەندییان بە تاوانە تیرۆریستییەکانەوە هەیە.

## ڕێگاکانی دژە تیرۆر

بەهۆی مەترسی لە ڕادەبەدەری تیرۆریستان کە ئێستا لە ئارادایە، زۆربەی حکوومەتەکان هێزی فرەوانی گرتن و دەستگیرکردنیان بە دەسەڵاتی جێبەجێکردن بەخشیوە. ئەم هێزانە بەشێوەیەکی گشتی کاتین و مەبەستیان دەستگیرکردنی تیرۆریستان و دوورخستنەوەی مەترسی توندڕەوەکانە لە کۆمەڵگا، لە هەمانکاتدا دوورکەوتنەوەش لە سەپاندنی کاری نادادپەروەرانە کە ڕەنگە ماف و ئازادییە مەدەنییەکان پێشێلبکات.

بەریتانیا، نمونەیەکی باشە کە وەك وڵاتێکی دیموکرات ئەم هێزانە بە فراوانی بەکار دەهێنێ. لە ساڵی ۱۹۷۳ەوە تا ئێستا ئەم وڵاتە ۳ یاسای سەربەخۆی دارشتووە کە ڕێگە بە ڕاپەراندنی کارەکان دەدات لە دەرەوەی دادگا. ئەمانیش بریتین لە یاسا یەك بەدوایەکەکانی ئێرلەندای باکوور. یەکەم یاسا لە ساڵی ۱۹۷۳دا مۆرکرا، یاسای قەدەغەکردنی تیرۆر لە ساڵی ۱۹۷۵ و، یاسای تیرۆر لە ساڵی ۲۰۰۰ دارێژران. ئەم یاسایانە پێویستە لەلایەن پەرلەمانی بەریتانی پێداچوونەوەی بۆ بکرێت و ڕەزامەندی لەسەر بدرێت لەسەر بنەمایەکی ڕێکوپێك کە تیایدا بە شێوازی جیاواز ڕێگەدراوە بە هێزی پۆلیس بۆ دەستگیرکردن و زیندانی کردنی ئەوانەی گومانی تیرۆریستیان لێدەکرێت.

## دژە تیرۆری نێودەوڵەتی

هاریکاری نێودەوڵەتی بۆ دژە تیرۆر لە ڕووی مێژووەوە تۆمارێکی ڕێکی نییە. هەوڵە هاریکارییە نێودەوڵەتییەکان لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیست چەند ڕێکەوتنامەیەکی جیاوازیان دژی ڕفاندنی فڕۆکە مۆرکرد، کە بریتیبوون لە کۆنگرەی (هاجی) بۆ دەست بەسەراگرتنی نایاسایی فڕۆکە لە ساڵی (۱۹۷۰) و، هەروەها کۆنگرەی (مۆنتریال) بۆ دامرکاندنەوەی کردە نایاساییەکان دژی سەلامەتی فڕۆکەی مەدەنی. بەردەوامبوونی هەوڵەکان وایانکرد کە ئەم پەیماننامانە فرەوان بێت و باوەش بۆ کۆمەڵێك ڕێکەوتنامەی دژە تیرۆری نێودەوڵەتی دیکە بکاتەوە. بەگشتی هیچ لەم تەقەلایانە سەرنەکەوتن بەهۆی کۆك نەبوونی کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی لەسەر دارشتنی پێناسەیەك بۆ تیرۆر.

ڕووداوە نوێیەکانی جیهان پێشبینی بەرەو پێشچوونی گەورە دەکەن لە جیدییەتی هاریکاری نێوان حکوومەتەکان بۆ جەنگان لە دژی تیرۆر. بەر لە ڕووداوی ۱۱ ی سێپتێمبەری ۲۰۰۱، نەتەوە یەکگرتووەکان چەند هەنگاوێکی گرنگی نا لەمەڕ سزادانی بزووتنەوەی تالیبان لە ئەفغانستان، کە پارێزگاری لە ئوسامە بن لادن دەکرد.

بڕیارەکانی ۱۲۷۶(۱۹۹۹)، ۱۳۳۳(۲۰۰۰) و، ۱۳۶۳(۲۰۰۱) ی ئەنجوومەنی ئاسایش سزای سەپاندە سەر بزووتنەوەی تالیبان بەهۆی داڵدەدانی ڕێکخراوی قاعیدە و دانەخستنی کەمپەکانیان لە ئەفغانستان. ئەم بڕیارانە گۆڕانکارییەك لە هەڵوێستی نێودەوڵەتی بەرانبەر بە تیرۆر نیشاندەدات. ئەمە هاوکاتە لەگەڵ پابەندبوون بە پەراوێزکردنی ئەو وڵاتانەی کە پەیڕەوکردنی یاسا نێودەوڵەتییەکان ڕەتدەکەنەوە.

هەر ڕۆژێك دوای هێرشەکەی ۱۱ی سێپتێمبەر، نەتەوە یەکگرتووەکان چاکسازی لە یاسای ۱۳۶۸ دا ئەنجامدا. تیایدا جەختی لەوە کردەوە کە نەتەوە یەکگرتووەکان بە هەموو شێوازێك لە دژی مەترسی کردەی تیرۆریستی بۆ سەر ئاسایشی نێودەوڵەتی دەجەنگێ. دوو هەفتە دواتر یاسای ۱۳۷۳ ی ئەنجومەنی ئاسایش چاکسازی تیادا کرا کە داوای نەهێشتن و دامرکاندنەوەی تیرۆری کرد.

## مێژووی تیرۆر

### سەرەتاکانی تیرۆر

٢٠٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا یەکەم کردە، کە ئێستا پێیدەڵێن تیرۆر لەلایەن خێڵی توندڕەوی (زیلۆتس) (Zealots) ئەنجامدرا، کە گروپێکی جولەکەی چالاك بوو لە ماوەی سەدەی یەکەمی پێش زایین. ئەم گروپە بەرهەڵستی یاساکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی (فەلەستینی ئێستا)ی کرد بە شێوازێکی تایبەتی کە کوشتن و تیرۆرکردن لە پێشەوەی هەموو کردارەکانیان بوو. جەنگاوەرانی زیلۆتس بۆ هێرشکردنە سەر دوژمنەکانیان خەنجەرێکی سەرەتاییان بەکاردەهێنا کە (سیکا)یان پێدەگوت. بەزۆری لە شوێنە قەرەباڵغەکانی نێو بازاڕ، یان ڕۆژانی ئاهەنگ و جەژنەکان، لە هەر شوێنێك کۆبوونەوەی خەڵك هەبووایە، کاری توندوتیژیان ئەنجامدەدا. هەروەك تیرۆریستەکانی ئێستا مەبەستی زیلۆتس لە کارەکانی ئەوەبوو کە ژمارەیەکی فراوانتر لە جەماوەر بکاتە ئامانج، چی لە ڕۆمانەکان، یان ئەو جولەکانەی کە لەگەڵیان هاوپەیمانن.

لەنێوان ساڵانی ١٠٩٠ ـ ١٢٧٢ بزووتنەوەیەکی ئیسلامی توندڕەو کە بە حەشاشین ناسرابوو، هەمان تاکتیکیان بەکارهێنا لە میانەی ململانێیان دژی خاچپەرستان کە بەشێکی سوریای ئێستایان داگیر کردبوو. ئەمانە هەمان بیرۆکەی خۆکوژی و خۆ قوربانیکردنیان هەڵگرتبوو کە ئێستا هەندێ گروپی ئیسلامی تیرۆریست پیادەی دەکەن. توندڕەوی بەلای ئەوانەوە کارێکی پیرۆز و خوداییە، ئەنجامدانی بەرەو بەهەشتی خودایان بەرزدەکاتەوە، بۆیە دەبێ لەپێناویدا خۆیان هیلاك بکەن یان بمرن.



### لە شۆڕشی فەرەنساوە تا جەنگی یەکەمی جیهان

تاوەکو شەڕی فەرەنسا (١٧٩١ ـ ١٧٩٩) ئایین پاساوێکی گەورە بوو لە بەکارهێنانی تیرۆر. بەڵام لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەم ئەم بارە گۆڕا و چەندین بیر و ئایدۆلۆژیای وەك ناسیۆنالیزم، ئانارشیزم* (ئاژاوە گێڕی)، مارکسیزم و هەندێ بزووتنەوەی سیاسی و عەلمانی دیکە گەشەیان کرد و بۆ بەربەرەکانێکردنی یاسا ئاسمانییەکان هاتنە مەیدان لە ڕێگەی پاشاکانەوە.

لەسەرەتادا تیرۆری هاوچەرخ دژی ڕژێمی پادشایەتی بوون کە لە کوتاییەکانی شۆڕشی فەرەنسا لە ڕێگەی یاخیبوون و شۆڕشەوە کارەکانیان ئەنجامدەدا. ڕێکخراوی ویستی گەل (Narodnaya Volya ) لە ماوەی نێوان ١٨٧٨ تا ١٨٨١ چالاکییەکانی ئەنجامدەدا. کارە شۆڕشگێڕییە دژ بە حکومییەکانی ئەم ڕێکخراوە بوون بە ڕێچکە و شێوازێك بۆ تیرۆری داهاتوو. ئەم گروپە هێزە داپڵۆسێنەرەکانی وڵاتیان دەکردە ئامانج و هەوڵیان دەدا هاوڵاتیان لەو نادادپەروەرییە بگەیەنن کە وڵات بەسەریدا سەپاندوون، ئەمەش بۆ بەهێزکردنی پاڵپشتی شۆڕشەکەیان لە نێو جەماوەردا. لە نێو ئەوانەی بوونە ئامانجی تیرۆریستان: پارێزگاری گشتی پیترسبۆرگ و، سەرۆکی پۆلیسی نهێنی قەیسەر و، خودی قەیسەر ئەلیکساندەری دووەم کە لە ساڵی ١٨٨١دا تیرۆر کرا.

تیرۆرکردنی ئەلیکساندەری دووەم هەستی گروپێکی سیاسی توندڕەوی بزواند کە چوار مانگ دواتر لە لەندەن کۆبوونەوە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر چۆنیەتی ئەنجامدانی شۆڕشێکی جیهانی نەك نەتەوەیی. بیرو بۆچوونیان ئەوە بوو کە بزووتنەوەیەکی ئانارشیستی نێو دەوڵەتی دروست بکەن. دوای ئەوەی ئاڵای ڕەشیان بۆ خۆیان بڕیار دا بە بزووتنەوەی ڕەشی نێو دەوڵەتی ناوبران. مەبەستیشیان لەم کارەدا هاوکاری و پاڵپشتی هەڵمەتی تیرۆرستی جیهانی بوو. بۆ ڕوخانی وڵاتانی

خاوەن ڕژێمی پاشایەتی و حکوومەتی هەڵبژێردراوی دیموکراتی کە بریتی بوو لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

لە نێوان ساڵانی ١٨٨١ دەی یەکەمی سەدەی بیست، ئانارشیستەکان ویلیەم ماکانیلی سەرۆکی ئەمەریکا و، سەرۆکی فەرەنسا و، سەرۆك وەزیرانی ئیسپانیا و، مەلیکە ئەلیزابیسی نەمسا و، مەلیکی ئیتاڵیا هیومبێرتی یەکەمیان تیرۆرکرد.

جگە لەمە ئەنارشیستەکان هەڵسان بە کاری ئاژاوەگێری و بڵاوکردنەوەی پەشێوی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. هەندێ جار ئەم سەرپێچیانە دەبوونە مایەی ڕژانی خوێن بەهۆی کاری توند و تیژییەوە. ئاژاوەکەی مەیدانی کافرۆشان لە شیکاگۆ، ساڵی ١٨٨٦ بە یەکێك لە ناودارترین ئەو ڕووداوانە دادەنرێت، کە ئەنارشیستەکان ئەنجامیان دا. کاتێك کە بۆمبێك لە ناوەڕاستی نزیکەی ٣٠٠٠ لە کرێکارە مانگرتووەکانی کارگە و پشتیوانییەکانیاندا تەقییەوە. کە دواتر خۆپیشاندەران و هێزی پۆلیس ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە، بەلایەنی کەمەوە حەوت پۆلیس و چوار خۆنیشاندەر کوژران و ٦٠ی دیکەش بریندار بوون. هەرچەندە بە وردی ژمارەی مردووەکان نازانرێ.

## تیرۆری حکومی دوای ساڵی ١٩٢٠

لەماوەی ساڵانی بیست و سییەکانی سەدەی بیست تیرۆر شێوازێکی دیکەی بەخۆیەوە گرت کە بریتی بوو لە ستەم و زوڵم و سەرکوتکردنی حکوومەتە دیکتاتۆرەکان دەرهەق بە هاوڵاتیانی خۆیان ئەمە لەبری پەیڕەوکردنی توندوتیژی لەلایەن گروپە ناحکومییەکان. لەم ماوەیەدا وشەی تیرۆر بۆ وەسفکردنی توندوتیژی و وەحشیەتگەری و تۆقاندن لەلایەن ڕژێمە سەرکوتکەرەکانی نازی و فاشیست و تۆتۆلیتارییەکان بەکارهات کە لە هەریەکە لە وڵاتانی ئەڵمانیا و ئیتالیا و سۆڤیەت هاتنە سەر دەسەڵات. ئەم ڕژێمانە زۆر نامرۆڤانە کرداری لێدان و داپلۆسین و ئازار و



ئەشکەنجە و شێوازی دیکەی تۆقاندنیان ئەنجامدەدا، کە تا ئێستاش هەندێ وڵات دژی هاوڵاتیانی خۆیان پەیڕەوی دەکەن.

بە شێوەیەکی گشتی کاری سزادان و سەرکوتکردن لە لایەن حکوومەتانەوە بە تیرۆر ناودەبرێت بۆ ئەوەی لە وشەی تیرۆریزم جیابکرێتەوە کە گروپە ناحکومییەکان لەدژی حکوومەتان پەیڕەوی دەکرێت.

## تیرۆری ئەنتی کۆلۆنیالیست
## (دژە داگیرکاری)

لەدوای جەنگی دووەمی جیهان، تیرۆر گەڕایەوە سەر هەمان شێوەی پێشووی خۆی کە بریتی بوو لە یاخیبوون و دروستبوونی کۆمەڵە و گروپی شۆڕشگێڕی. لە چل و پەنجاکانی سەدەی بیستدا وشەی تیرۆر بۆ وەسفکردنی توندوتیژی لەلایەن ناسیۆنالیستەکانەوە بەکارهێنرا. بەدرێژایی ئاسیا و ئەفریقیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گروپی ئەنتی کۆلۆنیالیست (دژە داگیرکاری) بەرانبەر بە ڕژێمە ئەوروپییەکان وەستان. وڵاتانی وەك ئیسرائیل، قوبرس، کینیا و، جەزائیر سەربەخۆیی خۆیان بۆ بەشێك لەم بزووتنەوە ناسیۆنالیستانە دەگەڕێننەوە کە کاری تیرۆریستیان ئەنجامدەدا.

بەرچاوترین ڕووداوی تیرۆریستی لەم ماوەیەدا، تەقینەوەکەی هوتێلی کینگ دێڤید بوو لە ئۆرشەلیم کە لە لایەن گروپێکی نهێنی (ڕێکخراوی سەربازی نەتەوەیی) ئەنجامدرا. هوتێلەکە شوێنی بارەگای سەرکردایەتی سەربازی و فەرمانگە کارگێڕییەکانی بەریتانیا بوو لە فەلەستین ٩١ کەس لە ڕووداوەکە کوژران و ٤٥ یش بریندار بوون کە لە ناویاندا ژن و پیاو و منداڵ و، عەرەب و، بەریتانی و جولەکە وەکو یەك بوون. ئەم تەقینەوەیە بە یەکێك لە بەدناوترین ڕووداوە تیرۆریستییەکانی سەدەی

بیست هاتە ژماردن. سەرۆکی گروپە تیرۆریستییەکەی ئەو ڕووداوەیان لەدەست کەوتەوە، (میناکیم بیگن) بوو کە دواتر بوو بە سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل و لە ساڵی ١٩٧٨ میدالیای ئاشتی نۆبڵی بردەوە.

بیگن تەنیا نییە لە نێو ئەوانەی کە بە تیرۆریست ناو دەبران، بەڵام دوای سەربەخۆبوونی وڵاتەکانیان، پلەو پایەیان بۆ بەرزترین ئاستی دەسەڵات بەرز بووەوە. پۆلێك هاوشێوەی هەیە کە بریتین لە: سەرۆکی کینیا (جۆمۆ کینیاتا) و، سەرۆکی قوبرس (ماکاریۆس) و، سەرۆکی جەزائیر ئەحمەد بن بیلا.

## شەستەکان و حەفتاکان

لە ساڵانی شەست و حەفتاکاندا، تیرۆر بوو بە هاندەرێکی ئایدۆلۆژی ڕوون و ئاشکرا. لەم کاتانەدا چەندین کەمە نەتەوایەتی مافخوراو و پەراوێزکراو باوەشیان بۆ تیرۆر کردەوە وەکو هۆکارێك بۆ سەرنجڕاکێشان و دەستەبەرکردنی پاڵپشتی نێودەوڵەتی بۆ کێشەکانیان. ڕێکخراوی ئازادیخوازی فەلەستینی دامەزرا بۆ دروستکردنی دەوڵەتێك کە لەمێژوودا بە فەلەستین ناودەبرا. خاکی فەلەستین لە ساڵی ١٩٤٨ بوو بە ئیسرائیل و کەرتی ڕۆژئاوا و غەزەش لە شەڕێکی شەش ڕۆژیدا لە ساڵی ١٩٦٧ لە لایەن ئیسرائیلەوە داگیرکرا.

لە ڕاستیدا گروپە فەلەستینییەکان بەرپرسن لەو ڕووداوانەی کە بەسەرەتای کاری تیرۆریستی نێودەوڵەتی ئێستا دادەنرێت. لە ٢٢ ـ ٧ ـ ١٩٦٨ سێ چەکداری فەلەستینی کە سەر بە بەرەی میللی ئازادیخوازی فەلەستینی بوون، فڕۆکەیەکی بازرگانی ئیسرائیلییان ڕفاند کە لە ڕێگایدا لەڕۆما بۆ تەل ئەبیب دەڕۆیشت. هەرچەندە ڕفاندنی ئەم فڕۆکەیە سەرەتا نەبوو، بەڵام بە یەکەم ڕفاندنی سیاسی دانرا کە بە ئاشکرا ڕوویدات. ئەم کارە بووە مایەی دروستبوونی ڕەخنەی نێو دەوڵەتی و ڕای گشتی.



دووساڵ دواتر بەرەی میللیی ئازادیخوازی فەلەستینی بە ئەنجامدانی ڕووداوێکی شانۆیی ڕێکوپێکی نێودەوڵەتی هەڵسا. کاتێك سێ فڕۆکەی بازرگانی، دووانی ئەمریکی و یەکێکی سویسرییان ڕفاند. ئەمە جگە لە چوارەم هەوڵیان بۆ ڕفاندنی فڕۆکەیەکی بەریتانی. فڕۆکەکان لە ئوردنەوە هەڵسابوون و لەڕێگادا تەقینەوە دوای ئەوەی کە لە سەرنشینەکانیان خاڵیکرابوونەوە. کامیراکانی تەلەفزیۆن ئەم ڕووداوەیان بۆ بینەران لەسەرتاسەری جیهان گواستەوە.

لە ئۆلۆمپیادی میونیخ ساڵی ١٩٧٢، ئەندامانی گروپێکی فەلەستینی کە ناویان سێپتێمبەری ڕەش بوو، چەند وەرزشوانێکی ئیسرائیلیان بە بارمتە گرت. جەماوەرێکی بەرفراوان لە هەموو جیهان لە کاتێکدا خەریکی سەیرکردنی یارییەکان بوون، لە ناکاو شاهێدی حاڵەتی ترسناکی چەند بارمتەیەك بوون کە بەهەوڵێکی سەرنەکەوتووی پۆلیسی ئەڵمانی کۆتایی هات کاتێك تەقەی لە هەردوولا: تیرۆریستان و دیلەکان کرد. کوژرانی ١١ ئیسرائیلی لەو ڕووداوەدا یەکێکە لەو کارە تیرۆریستیانەی کە توانای تیرۆریستان بۆ ڕاکێشانی سەرنجی جیهان بۆ لای خۆیان دەردەخات.

لە ماوەی گەشەسەندنی هۆشیاری نەژادی و ناسیۆنالیستی جیهانی، جۆرێکی دیکەی گروپی ناسیۆنالیستی سەریان هەڵدا کە بۆ ناساندنی کێشەکانیان لە تەقەلای پێشبرکێی نموونەکەی فەلەستیندا بوون. لە نموونەی ئەم جۆرە گروپە، گروپی جوداخوازی فەرەنسی ـ کەنەدییە. ئەمانە هەڵسان بە ڕفاندنی پەیامنێری بازرگانی بەریتانی لە کویبیك (جیمس کرۆس) و، وەزیری کاری کویبیك (پیری لاپۆرتی) لە ساڵی ١٩٧٠، ناوی گروپەکە بریتی بوو لە بەرەی ڕزگاریخوازی لە کویبیك (FLQ). هەرچەندە کرۆس ئازاد کرا بێ ئەوەی ئازار بدرێ، بەڵام لاپۆرتی زۆر وەحشیانە کوژرا. دوای ئەوەی کە باری ناوچەکە شڵەژا و ترس و پەشێوی بڵاوبووەوە، سەرۆك وەزیرانی کەنەدی (پیری تیرودیۆ) پەنای بردە بەر یاسای هێزی جەنگ لە کویبیك کە ئازادی مەدەنی دابین

دەکات، بۆیە هێزێکی زیاد لە پێویستی بە سوپا بەخشی بۆ پارێزگاریکردن لە سیستەمی هەرێمەکە و لە ڕیشە هەڵکێشانی (FLQ).

لە کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا، توندڕەوە سیاسییەکانی ڤێتنام هەڵسان بە دروستکردنی گروپی تیرۆریستی بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەدەخولی ئەمریکی لە وڵاتەکەیاندا. داواکاریشیان بریتی بوو لە هەڵگرتنی جەور و ستەم و ناعەدالەتی وڵاتێکی دیموکراتی لیبرالی سەرمایەدار. ئەم توندڕەوانە بەزۆری لە ڕێکخراوی ڕادیکالی قوتابیان و بزووتنەوە چەپەکان بوون، کە دواتر لە ئەمەریکای لاتینی و ڕۆژئاوای ئەوروپاو ویلایەتە یەکگرتووەکان سەریان هەڵدا.

گروپی تیرۆریستی وەك کۆمەڵەی بادەر مینهۆف لە ئەڵمانیا و لیوای سووری ئیتالیا لە کەمپەکانی فەلەستین لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕاهێنانەکانیان ئەنجامدەدا. لە ناودارترین چالاکییەکانی بادەر مینهۆف، ڕفاندن و کوشتنی ساماندارو پیشەسازکاری ئەڵمانی هانز مارت سکلێیەر. کەچی لیوای سووری ئیتالیا هەڵسا بە ڕفاندن و لە سێدارەدانی سەرۆك وەزیرانی پێشووی ئیتالیا ئەڵدو مۆردۆ لە ساڵی ١٩٧٨.

**هەشتاکان و نەوەتەکان**

لە ماوەی حەفتاکاندا، لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات، بزووتنەوە تیرۆریستییەکانی وەك نازی نوێ و فاشیستی نوێ (یان باڵی ڕاست) سەریان هەڵدا بۆ وەڵامدانەوەی ئەو توندوتیژییەی کە لەلایەن باڵی چەپەوە پیادە دەکرا. هەرچۆنێك بێت گروپەکانی باڵی ڕاست هەم لە ڕووی ژمارە و هەم لە ڕووی پاڵپشتی جەماوەرەوە لە بەرانبەرەکانیان (باڵی چەپ)، لاوازتر بوون. بۆیە کارە توندوتیژییەکانیان بە شێوەی



پچڕپچڕ و کورتخایەن بوو. لەم ماوەیەدا سێ ڕووداوی توندوتیژی بە تیرۆریستەکانی باڵی ڕاستەوە لکێندرا. لە ساڵی ١٩٨٠دا لە بۆلۆنگا ـ ئیتالیا، تەقینەوەیەك لە وێستگەیەکی شەمەندەفەر ڕوویدا کە ٨٤ کەس کوژران و ١٨٠ ی دیکەش بریندار بوون. هەر لە هەمان ساڵدا بۆمبێکی چێنراو لە ڕۆژی ئاهەنگێڕانی فیستیفاڵی ئۆکتۆبەر لە میونیخ تەقییەوە کە لەلایەن ئەندامێکی گروپی نیو فاشیستییەکانەوە دانرابۆوە، تیایدا ١٤ کەس کوژران و ٢١٥ ی دیکەش بریندار بوون. لە ساڵی ١٩٩٥ یش سوپەرایماسیستە** سپییەکان بارهەڵگرێکی مینرێژکراویان لە ژێر باڵەخانەی فیدرالی ئەلفرێد موراە لە ئۆکلاهۆما تەقاندەوە کە تیایدا ١٨٦ کەس بوونە قوربانی.

زیندووبوونەوەی تیرۆری ئایینی و، سەرهەڵدانی تیرۆری چاودێریکراو لەلایەن وڵاتانەوە، بە گرنگترین ئەو پێشهاتچوونانە دادەنرێن کە لە ساڵانی هەشتاکاندا ڕوویاندا.

نموونەی هێرشی تیرۆریستی کە باوەڕ وایە لەلایەن وڵاتانەوە پشتگیریکراوبێت، تەقەڵای کوشتنی پاپا (جۆن پاوڵی دووەم) بوو لە ساڵی ١٩٨١ لەلایەن هاوڵاتییەکی تورك کە گومانی لێدەکرا بۆ دەزگا سیخوڕییەکانی ڕووسیا کاربکات. نموونەیەکی دیکە بریتییە لە ئۆتۆمبێلە مینرێژکراوەکەی ئێران لە بەردەم باڵیۆزخانەی ئەمەریکاو بنکەی سەربازەکان لە بەیروت ساڵی ١٩٨٣. هەروەها ڕۆڵی لیبیا لە تەقینەوەی فڕۆکەکان لەسەر ئاسمانی لۆکەربی لە سکۆتلەندا ساڵی ١٩٨٨.

ئەگەر ئایین لە هەردوو ڕووداوی تیرۆرکردنی سەرۆکی میسری ئەنوەر سادات ساڵی ١٩٨١، لەلایەن ئیسلامییە توندڕەوەکان و، ئیسحاق ڕابینی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل ساڵی ١٩٩٤، لە لایەن سەربازێکی جوولەکە، هاندەری ڕاستەخۆ نەبووبێت، ئەوا وەکو پاساو و بیانووی توندوتیژی تیرۆریستی بەکارهاتووە. لە هەردوو بارەکەدا تیرۆریستان کارەکانیان بە پابەندبوونی ئایینی دادەنێن لە پێناو ڕاگرتنی هەوڵەکانی ئاشتی. ساڵی ١٩٩٣ تیرۆریستە موسوڵمانەکان لە بنکەی بازرگانی نێودەوڵەتی

تەقینەوەیەکیان ئەنجامدا لە نیۆیۆرك. هەروەها لە سالّی ١٩٩٥ هێرشێك بە گازی دەمار کرایە سەر تونێلّێك لە یابان کە گروپێکی (ئوم) لێی بەرپرسیار بوو. ڕێکخراوی قاعیدەی ئوسامە بن لادن دوو هێرشی دیکەی خۆکوژی لەیەك کاتدا کردە سەر بالّیۆزخانەکانی ئەمەریکا لە تنزانیا و کینیا سالّی ١٩٨٨. لە سالّی ٢٠٠٠یش هێرشێکی دیکەی خۆکوژی کرایە سەر کەشتی جەنگی ئەمەریکی لە بەندەری عەدەن و جگە لە هێرشە خۆکوژییەکەی ١١ی سێپتێمبەری ٢٠٠١ بۆ سەر بنکەی بازرگانی نێودەولّەتی و پنتاگۆن.

## داهاتووی تیرۆر

تیرۆر، بەلایەنی کەم ٢٠٠٠ سالّە هەیە و، لەوانەیە لە ئەجیندا سیاسییە نێوخۆیی و نێودەولّەتییەکان بۆ سالّانی داهاتووش هەر بمێنێ. تیرۆر هۆکارێکە لە ڕێگەیەوە بێ هێز ڕووبەڕووی بەهێزتر لەخۆی دەبێتەوە، بۆیە داوایەکی بەردەوامی ئەوانەیە کە مافخوراوو پەراوێزکراون، ئەوانەی تۆلّەسێن و ڕق خواردوون، ئەوانەی بێ هێزن و هیواخوازی بەهێز بوونن. هەلّسان بەم کارەش تاڕادەیەك ئاسانە کە هەولّ و تەقەلّای گەورەی لە پێناو دەبەخشن. هەولّ و توانای هاندان بۆ ترس و تۆقاندن و دلّەڕاوکێ و سەپاندنی ئازارو ئەشکەنجە لە پێناو ناچارکردنی بەرانبەر بۆ ڕازیبوون و ملکەچیکردن لەسەر داواکانیان. زیاتر لەوە، تیرۆر بە بەردەوامی گەشە دەسێنێت بۆ زالّبوون بەسەر ئەو دژە کردانەی کە حکوومەت بۆ لەناوبردنیان نەخشەو پلانی بۆ دادەڕێژێ، بۆیە تیرۆر بەردەوام بەدوای ئامانجی نوێدا دەگەڕێ و هەولّی هێرشکردنە سەر بەرانبەرەکانی دەدات بە شێوەیەکی نادیار. لەوانەیە ڕێگای نوێ و هاوچەرخ بگرنە بەر لە هێرشەکانیاندا، وەك بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و بایۆلۆژی و ڕادیۆیی (بلّاوکردنەوەی تیشکە چالاکی) یان چەکی ناوەکی. بۆی هەیە تاکتیکی تیرۆریستەکان بگۆڕی و تیرۆری



کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت بگرێتەوە، کە لەم ڕێگەیەوە تۆڕەکانی کۆمپیوتەرو سیستەمەکانی تێکبدەن. یان لەوانەیە جەنگی ئەلیکترۆنی بەرپابکەن کە هۆکارەکانی وزەو پەیوەندیکردن و گەیاندن، یان کۆمەلّگە بەگشتی بکەنە ئامانج.

تیرۆر بەدرێژایی جیهان خۆی دەگۆڕێت بۆ شێوەی نوێترو ترسناکتر، گروپە کۆن و توندڕەوەکان لەناو بردران و دوور خرانەوە، کەچی گروپی توندڕەوتر و توندوتیژتر شوێنی ئەوانیان گرتەوە. هەرچەندە لەوانە نییە تیرۆر بە یەکجاری ڕیشە کێش بکرێت، دژایەتیکردنی مەترسی و هەڕەشەکانیان ئاگاداری بەردەوامی دەوێت. بەهێزی سروشتی تاکەکان بۆ کێشەی تیرۆرو جۆراوجۆری ئەنجامدەرانی و ئالّۆزی سیفەتەکانیان، لە ڕووڕاوەستان و بەرەنگارییەکی بەهێزی گەرەکە لە لایەن ئەوانەی دەیانەوێت چالاکانە دژی ئەو هەڕەشە و مەترسییانە بوەستن.

* ئانارشیزم : بۆچوونێکی سیاسییە کە باوەڕی بە یاسا و دەسەلّات نییە، واتە ئاژاوەگێڕی.

** سوپەر ریماسیست: ئەوانەن کەوا هەستدەکەن ڕەگەزی ئەوان لە هەموان بالّاترە و دەبێ دەسەلّات هەر بۆ ئەوان بێ.

Encarta Reference Library 2004,(CD)

# بیرۆکەی تیرۆریزم و پیادەکردنی

ن: بێن دێستی
و: هێمن غەنی

بەدحاڵیبوونێکی زۆر هەیە دەربارەی تیرۆریزم، وەك هەر چەشنێکی تر لە جەنگ، تیرۆریزمیش دەرئەنجامی کارەساتبار و مەینەتهێنەری لێدەکەوێتەوە.

بەڵام لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی ڕەفتاری تیرۆرستان کارێکی ئاڵۆز و زەحمەت نییە. کاتێك شاڵاوێکی تیرۆریستی بە باشی بەڕێوە دەبرێت، ئەوا لە پشت هەر کردارێکەوە مەبەست و مەرامێك هەیە. جەنگیش بە هەمان شێوە قابیلی لێکدانەوە و تێگەیشتنە، بە هەمان شێوە جەنگیش وێرانکاری و کارەساتی لێدەکەوێتەوە. بەڵام هیچ کاتێك جەنگەکان بێ هۆ هەڵناگیرسێن و، سەرەڕۆیی و سەرکێشی هۆکاری هەمیشەیی ڕوودانیان نین.

کەسانی ڕەوشتبەرز و خاوەن عەقڵی دروستیش پەنا بۆ جەنگ دەبەن گەر گەیشتنە ئەو قەناعەتەی جەنگ نەکردن بارودۆخەکە خراپتر دەکات. ئەگەر یەکێك لە لایەنەکانی ناکۆکییەکە نەیتوانی داواکارییەکانی بە ڕێگای دیپلۆماسیانە بە دەست بهێنێت بیر لە جەنگ دەکاتەوە و پەنای بۆ دەبات.



یەکێك لە وتە بەناوبانگەکانی کلاوزفز ئەوەیە ((جەنگ درێژەدانە بە سیاسەت بە هۆی بەکارهێنانی ئامرازی دیکەوە)).

بەڵام چەندین ڕێگای دیکە هەیە بۆ بەردەوامیدان بە جەنگ، کە تەنها بەگژیەکداچوون و بەیەکدادانی سوپا و سەربازەکان نییە لە گۆڕەپان و بەرەکانی جەنگدا، بە شێوەیەکی دیاریکراو ئەم جۆرەی جەنگ (ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی) تەنها ئەو کاتە ڕوودەدات کە هەر دوو لایەنی ململانێیەکە لە ڕووی هێزو توانای سەربازییەوە لە یەك نزیك بن. بەڵام گەر بەم جۆرە دژی ڕکابەرەکانت بجەنگیت کە بێ ئەندازە لە تۆ بەهێزتر و باڵادەسترن، ئەوا ڕێگەیەکی نموونەیی ئەگریتەبەر بۆ خۆکوشتن.

ئەگەرچی لە هەندێ بوار و ئاستدا لە دوژمنەکەت لاوازتر بیت ئەوا مانای ئەوە نییە شکستت هێناوە و بەزیویت، بە مەرجێ کە تاکتیکە گونجاوەکان بگریتە بەر. دەتوانیت شەڕی گەریلایی دژی دوژمنەکەت بکەیت، یاخود کرداری تیرۆریستی ئەنجام بدەیت. تیرۆریزم نزمترین ئاستی جەنگە، کە کەمترین توانست و سەرچاوەکانی هێز دەخوازێت لە لایەن لایەنە لاوازەکانەوە. تیرۆریزم جەنگ کردنە بە تێچوونێکی کەم. تیرۆریستان دەتوانن براوە بن.

لە ڕاستیدا تیرۆریزم بە هەڵە ناو دەبرێت، لەبەر ئەوەی ئامانجی تیرۆر چاندنی ترس و دڵەڕاوکێ نییە (ئەگەرچی ئەمە تاکتیکی هاوبەشە). بەڵکو ئامانجی تیرۆریزم چاندنی شپرزەیی و لێکترازان و بێ سەروبەرییە لەگەڵ ناچارکردنی ڕکابەرە بەهێزەکانیان تا کاردانەوەی زیادڕەوانە و وروژێنەرانە بگرنەبەر. یەکێك لە ناسازاییەکانی تیرۆریزم ئەوەیە کاتێك ڕکابەرەکەت کردارگەلێکی توندوتیژ ئامێزانە دژی خەڵکەکەت ئەنجام دەدات، ئەوا تۆ (تیرۆریستەکە) ململانێکە دەبەیتەوە و هێزی پتر بە دەست دەهێنیت.

هەمیشە هۆكارێك هەیە بۆ بەرپاكردنی جەنگ و تەنها سێ ڕێگا هەیە بۆ کۆتایی پێهێنانی، کە هەموویان بنبڕکردنی هۆکاری جەنگەکە بەرجەستە دەکەن.

یەکەم، بۆی هەیە یەکێك لە لایەنەکانی ململانێیەکە بە تەواوی تێکبشکێت، یاخود لایەنی دۆڕاوی جەنگەکە دەست لە ململانێکە هەڵبگرێت لەبەر ئەوەی بەو باوەڕە گەیشتووە کە ناتوانێت چیتر بەرگەی زەرەر و زیانەکان بگرێت بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکەی، یاخود بە پێچەوانەوە باوەڕی وایە ئامانجەکانی بەدەستهێناوە بۆیە واز لە جەنگکردن دەهێنێت.

تەنها بە هۆی سازشکردن لەگەڵ ڕکابەرەکەتدا یاخود ورە پێ بەردان و نائومێد کردنی یان تێکشکاندن و لەناوبردنی دەتوانیت سەرکەوتن لە جەنگەکەدا بە دەست بهێنیت.

تیرۆریستان بە چەندین ڕێگا دەتوانن سەرکەوتن بەدەست بهێنن، لە ڕێی لاوازکردنی ئیرادەی ڕکابەرەکەیانەوە (تەنانەت هێزە باڵاکانیش) تا ئاستی چۆکپێدادانیان، یاخود لە ڕێگەی بەهێزکردنی بەرەی تیرۆریستانەوە لە ڕێی هێنانە ڕیزی ئەندامی نوێ تاوەکو شاڵاوەکە بگۆڕێت بۆ کرداری گەریلایی یاخود شاڵاوێکی سەربازی، یان فشارهێنان بۆ لایەنە دەرکییەکان بۆ سەپاندنی چارەسەرێك کە لە بەرژەوەندی تیرۆرستان بێت و ئەوان بیخوازن.

لە هەر شاڵاوێکی تیرۆریستیدا (بە هەمان شێوە لە هەر جەنگێکدا) حەوت هاوبەش و بەشداری گرنگ و هەستیار هەن، هێزەکانمان، هاوڵاتیانمان، هێزەکانیان، هاوڵاتیەکانیان، هاوپەیمانەکانمان لە دەرەوەی بازنەی ململانێیەکە، هاوپەیمانەکانیان لەگەڵ باقی جیهاندا.

هێزەکانمان لە هەموو ئەو خەڵکانە پێکهاتوون کە لە بەرژەوەندی ئێمە چالاکانە بەشداری ململانێیەکە دەکەن. هاوڵاتییەکانمان پێکهاتوون لە هەر کەسێك پاڵپشتی



شاڵاوەکەمان دەکات بە بەشداری کردنەکانی یاخود بە بەخشینی باجەکان. هێزەکانیان و هاوڵاتییەکانیان بە هەمان شێوە.

هاوپەیمانەکانمان ئەو گروپ و حکوومەتانەی دەرەوەی بازنەی ململانێکەن کە پاڵپشتی مادیان دەکەن یاخود بە هۆی فشاری دیبلۆماسییەوە چارەسەرێك دەسەپێنن کە بەرژەوەندی و خواستی ئێمەی لەسەربێت. بە دڵنیاییەوە ڕکابەرەکانیشمان بە هەمان شێوە هاوپەیمانی خۆیان هەیە.

بەشەکەی تری جیهان پێکهاتوون لەو خەڵکانەی کە ئەگەری ئەوەیان لێدەکرێت بدەنە پاڵ لایەنێکی ململانێکە، یاخود بۆیان هەیە لە کۆتاییدا چارەسەرێکی ئاشتیانە و دیبلۆماسیانە بسەپێنن و یان بە هەر هۆکارێکی دیکە ململانێکە یەکلا بکەنەوە (کە دەستێوەردانی سەربازیش دەگرێتەوە).

لە شاڵاوی ئێمەدا وەك تیرۆریستان (لێرەدا نووسەر لەسەر زمانی تێرۆرستانەوە قسەدەکات) ئامانجمان لاوازکردنی بەردەوامی دوژمن و بەهێزکردنی بەردەوامی خۆمانە، بۆ ئەوەی نا هاوسەنگی هێزی نێوانمان ڕاست بکەینەوە. دەمانەوێت خەڵکانی ئێمە پەیوەندی بکەن بە ڕیزەکانمانەوە. دەمانەوێت هێزە بێ لایەنەکانی جیهان بکەینە هاوپەیمانمان.

دەمانەوێت دەوڵەتە بێ لایەنە خاوەن هێزەکان قەناعەت پێ بهێنین کە باشترین بەرژەوەندی ئەوان دابین دەبێت ئەگەر هاتوو چارەسەرێکیان بەسەر دوژمنەکانماندا سەپاند، خواستی ئێمەی لەسەر بێت. شانبەشانی درێژەکێشانی ململانێکە، دەبێت ئەم خواست و کۆششانەش بەردەوام بن.

هەموو ئەم چالاکییانەش پێویستیان بە شاڵاوی تیرۆریستی سەرکەوتوو هەیە کە پەیوەندی ژێر بە ژێریی و نهێنی بە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جیهانییەوە هەبێت.

چەکی بنەڕەتی و سەرەکی دەستی تیرۆریستان پەخشکردن و بڵاوکردنەوە و سەرنج ڕاکێشانە.

گەر ئێمە تیرۆریست بین ئەوا بێ هێزین و ژمارەمان کەمە. پێویستمان بە خۆ حەشاردان دەبێت لە شێوەی دەستەو شانەدا خۆمان ڕێك بخەین. ئەو چەکەی لەبەر دەستماندایە کردارە تیرۆریستییەکانە، ئێمە لێرە و لەوێ دەردەکەوین، گورزێك دەوەشێنین کە ڕەوتی ڕووداوەکان تێکدەدات، دووبارە بزر دەبینەوە.

کاتێك چالاکانە لە شاڵاوبردندا نابین، ئەوا وەك هەر هاوڵاتییەکی ئاسایی دەردەکەوین. کاتێك بە کردارێکی تیرۆریستی هەڵدەستین، ئامانجمان ناچارکردنی هێزە ڕکابەرەکانمانە کە کاردانەوەیکی توندوتیژ و تۆڵەسەندنەوە ئەنجام بدەن.

بەڵام هەر لەو کاتەوەی کە نازانن ئێمە کێین، ئەوا ڕق و تۆڵەسەندنەوەی خۆیان بەسەر خەڵکی ئێمەدا دەڕێژن، کە ئەمەشە خواستی خەڵکانی ئێمە بۆ بەرگری و بەرەنگاری زیاد دەکات بۆ پەیوەندیکردن بە ڕیزەکانمانەوە.

هەر کاتێك توانیمان ئەم هەستی تۆڵەسەندنەوەیە بوروژێنین، ئەوا پرۆسەی هێنانە ڕیزی ئەندامی نوێ سەرکەوتووتر دەبێت و هێزەکانمان زیاتر گەشە دەکەن. بە پێچەوانەی ئێمەوە هێزەکانی دوژمن دیار و بەرچاون. گشتی و ناسراون، لەگەڵ ئەوەی کە ناتوانن هێزەکانی ئێمە بکەنە ئامانج، بەڵام ئێمە دەتوانین هێزەکانی ئەوان بکەینە ئامانج. لە هەندێ بارودۆخدا لەوانەیە بڕیاری هێرشکردنە سەر هاوڵاتییەکانیان بدەین، بەڵام بەزۆری هەوڵدەدەین هێرش بکەینە سەر هێزەکانیان. یەکێکی تر لە ئاسەوارەکانی ئەم شاڵاوە شەکەتکردنی هاوڵاتیانە تا وایان لێبکەن ئیرادەی ئەخلاقی لە دەست بدەن کە ببێتە هۆی لە دەستدانی ئیرادەی سیاسییان، لەوانەیە ئەم ململانێیە بە سەرکەوتنی ئێمە کۆتایی بێت بەبێ ئەوەی ناچاربین ململانێکە بگۆڕین بۆ شەڕێکی ڕاستەقینە، لەوانەیە بێ ئەوەی چوارچێوەی



ململانێکە بۆ ئاستی هەڵگیرساندنی شەڕ فراوان بکەین ئەوان نائومێد بن و چۆك دابدەن.

لەوانەیە هەندێ جار هێرشکی مەبەستدار و ڕاستەوخۆ بکەینە سەر هاوپەیمانانی دوژمنەکەمان، بە ئومێدی ئەوەی ئەو ڕاستییەیان بخەینە بەرچاو کە باجی هاوپەیمانێتیکردنیان بۆ دوژمنەکانمان زۆر گرانە. ئەم هێرشەش بۆی هەیە وایان لێبکات دەست لە هاوپەیمانەتییەکە هەڵگرن، یاخود دوژمنەکانمان ناچار بکەن ڕێگا چارەیەك قبوڵ بکەن خواستی ئێمەی لەسەر بێت.

ئەمەش دوژمنەکانمان دەخاتە بارودۆخێکی دژوارەوە، چونکە زیادبوونی ڕێ و شوێنەکانی تۆڵەسەندنەوە کۆتایی بە ململانێکە ناهێنێت کاتێك ئێمە بەردەوام دەبین لەبەرگری و بەرهەڵستکردن، هەر بۆیە خۆیان لە بارێکدا دەبیننەوە کە ناچار بن سازشمان لەگەڵدا بکەن، لەوانەیە ئەم سازشکردنەش بەس بێت بۆ هێنانەدی ئامانجەکانمان.

بە دڵنیاییەوە بەرپەرچدانەوەی تۆڵەئاسای دوژمنەکانمان دەبێتە هۆی لە دەستدانی گیانی زۆرێك لە هاوڵاتیان و خەڵکانی ئێمە. بەڵام ئیتر جەنگ خۆی لە خۆیدا کردارێکی قێزەونە و، کاتێك بڕیاری بەرپاکردنیمان دەرکرد ئەو ڕاستییەمان لەبەر چاو بوو کە گیانی زۆرێك لە خەڵکی دروێنەدەکات. بەڵام لە هەمان کاتدا بڕیارماندا هەڵگیرساندنی جەنگ شایستەی ئەم قوربانیدانەیە بە هێزەکانمان بە کوشتنی خەڵکانی ئێمە لاواز نابن، بەڵکو لە ڕاستیدا بە هۆی پەیوەندی کردنی زیاتریان بە ڕیزەکانمانەوە و پاڵپشتی لێکردنمان هێزەکانمان زیاتر گەشە دەکەن. کاتێك دوژمنەکانمان توندوتیژانە تۆڵەمان لێدەکەنەوە دەبێتە هۆی ئیدانەکردنیان لە ڕووی ئەخلاقیەوە لەلایەن هاوپەیمانەکانمانەوە (کە وایان لێدەکات ڕاستەوخۆ پتر پشتگیریمان بکەن، تەنانەت پاڵپشتی لۆجستیمان بکەن).

بۆی هەیە دەوڵەتە بێ لایەنە جیهانییەکانیش بدەنە پاڵ ئێمە. هەروەها لەوانەیە هاوپەیمانەکانی خۆیان سەرزەنشتیان بکەن و کەمتر پاڵپشتیان بکەن لە ڕووی ماددی و سیاسییەوە.

بە دڵنیاییەوە داخوازییەکانمان لەگەڵ هەستی گشتی و بیرکردنەوەی هاوڵاتیانماندا دەگونجێت، گەر وانەکەین ئەوا ناتوانین ڕیزەکانمان پتەوبکەین ئەگەرچی کاردانەوەی توندوتیژانەشمان بەرانبەر ئەنجام بدەن.

نموونەیەکی زەق و بەرچاو لەوانەیە کەسێکی سەرکێشی وەك تێد کاکزنسکی بێت، ئەو تیرۆریستە تاقانەیەی لە ماوەی پانزە ساڵی شاڵاوەکەیدا هەرگیز هیچ هاوپەیمانێکی بەدەست نەهێنا، کاتێك دەستگیر کرا، بزووتنەوە تیرۆریستییەکەی کۆتایی پێ هات بەڵام ئایا توانی سۆز و سەرنجی خەڵکانی خۆی ڕابکێشێ؟ کە ئەگەر هاوسۆزی هەبوایە بۆی هەبوو بەردەوامی و برەو بە بزووتنەوەکەی بدەن.

با چاو بە چوار شاڵاوی تیرۆریستی تەقلیدی لە مێژوودا بگێڕین:

ماکویس، ئازادکردنی هیند، بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان لە ئەمریکا، ململانێی فەلەستینی دژی ئیسرائیل.

دەستبەجێ کاردانەوەی تۆ ئەوە دەبێت بۆچی گاندی و کینگ وەك تیرۆریست لە قەڵەم دراون. چونکە سەرەڕای ئەوەی کردوویانە، ئەوان پیاوانی جوامێر و خاوەن ڕەوشتی بەرز بوونە و کەسانی شەرەفمەندبوونە لە مێژوودا.

بەڵام تیرۆریزم توندوتیژی ناخوازێت، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دواوە و لێکدانەوەی ئێمە دەربارەی ستراتیژیەت بخوێنیتەوە بۆت دەردەکەوێت کە بۆ یەکجاریش نەمان وتووە دەبوایە لایەنی ئێمە کرداری توندوتیژانەمان بکردبایە لە شاڵاوە تیرۆریستییەکەماندا. ئێمە دڵە ڕاوکێ و لێکترازان دروست دەکەین کە مەرج نییە زەبروزەنگ بەکار بهێنین.



ئامانجی ئێمە ناچارکردنی ڕکابەرەکەمانە تا توندوتیژ بێت و، بۆی هەیە بە کرداری توندوتیژانە لە لایەن خۆمانەوە هەمان مەبەست بهێنینەدی. بەڵام بە لەبەرچاو گرتنی بارودۆخی خۆمان، تیرۆریزمی ناتوندوتیژانە بۆی هەیە باشترین ڕێگە بێت بۆ گەیشتن بەم ئامانجە.

بەڵام یەکەم شاڵاوی تیرۆریستی توندوتیژی تەقلیدی بزووتنەوەی ماکویس پەیرەویان لێکرد. کە ئەمە بزووتنەوەیەکی بەرگری فەرەنسی بوو دژی داگیرکردنی ئەڵمانی لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا. ئەوان لە شێوەی شانەدا چالاکییەکانیان بەڕێوە دەبرد، بەبەکارهێنانی چەکە دزراوەکان یاخود ئەو چەکانەی بە قاچاغەوە لە بەریتانیاوە دەیان هێنا. ئەوان بنکە سەربازییەکان و هێزەکانی دوژمن و سیخوڕەکانیان دەکردە ئامانج. وەڵامی ئەڵمانییەکان لە لایەن سوپاوە ڕێکدەخرا کە زۆر دڵڕەقانە و دڕندانە بوون. ئاستی قوربانییەکان لە نێو ماکویس دا یەکجار ترسناك و ڕاچڵەکێنەرە و، ژمارەی دەستگیرکراوەکان زۆر مەترسیدار بوو. چونکە ڕووبەڕووی ئازار و ئەشکەنجە دەبوونەوە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لێیان.

لە لایەکی دیکەوە، وەڵام و کاردانەوەکانی ئەڵمانییەکان تەواو ورد نەبوون، کە بووە هۆی کوشتن و ئەشکەنجەدانی چەندان فەرەنسی بێتاوان.

ئەم بوغز و ڕقە لە بەرانبەر فەرەنسا، بە شێوەیەك لە شێوەکان بالاتر بوو بە تایبەتی دوای کارەساتە سەربازییەکەی ساڵی ١٩٤٠، بووە هۆی زیادبوونی بەردەوامی شەپۆلی پەیوەندیکاران بە ڕیزەکانی بەرگرییەوە. لە کاتێکدا قوربانییەکان لە نێو ماکویسدا بەرەو هەڵکشان دەچوو، ڕیزەکانی بەرگری زیاتر دەبوون وەکاتێك شەڕەکە گەورە بوو ژمارە و هێزی بەرگریکاران زیادی کرد.

ئەمە وەك پڕوپاگەندەیەك بۆ سەرکەوتن لە ڕۆژئاوادا بەکار هات و، بە دیاریکراوی یارمەتیدەری قەناعەت پێهێنانی خەڵکانی ئەمریکا بۆ پاڵپشتی

کردنی داگیرکردنی فەرەنسا. سەرکردەکانی ئەمریکا هەمیشە خواستیان بوو، بەڵام پێویست بوو قەناعەت بە جەنگەکانی ئەمریکا بهێنن کە زەرەر و زیانی و بەرزی ئاستی لە دەستدانی زیانی ئەمریکییەکان گرنگی و بایەخی خۆی هەیە.

بەڵام سەرئەنجام لە ساڵی ١٩٤٤ دا خەڵاتەکە هات، لە ڕادیۆوە ئاماژەیەك لە لەندەنەوە، ماکویس لە تیرۆریزمەوە بۆ کرداری گەریلایی گۆڕا و هێزی خۆی کۆکردەوە. ئامانجی سەربازی خۆی سنووردارکرد، بەڵام ئامانجی هەستیاری دیاریکرد: ڕێگەگرتن.

هێزەکانی ماکویس هێزە چەکدارەکانی کەنداو بەریتانیا و ئەمریکایان بینی و یارمەتییان پێشکەش کردن، بەڵام لەمەش گرنگتر بەڕێوەبردنی بەهێزی کردارەکان بوون لە پشت هێڵەکانی ئەڵمانی و هێرشکردنە سەر هێڵەکانی شەمەندەنەفەر و پردەکان و ڕێگا سەرەکییەکان و هێڵەکانی گەیاندن و پەیوەندیکردن بوو؛ ئامانجەکە ڕێگا گرتنە لە ئەڵمانیا لەوەی هێز و کەلوپەلەکانی بۆ نورماندی بگوازێتەوە بۆ شەڕکردن لە دژی داگیرکاری.

بە دڵنیاییەوە ماکویسەکان لە هەموو بوارێکدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، هەموو ئەوەی هیوایان بۆ دەخواست بە دەستیان هێنا. ئەڵمانییەکان دەرکران. ئەمریکی و بەریتانی و کەنەدییەکان نازناوێکی مێژوویی شەرەفمەندانەیان بەسەردا دابڕا (هێزی ڕزگار کردن).

کە بەڕاستی بەکاری ڕزگار کردن هەستان کە لە دواییدا وڵاتە ڕزگارکراوەکانیان بەجێهێشت. ماکویسەکان باجێکی گرانیان بۆ سەرکەوتنەکەیان دا، بەڵام سەرکەوتنێکی تەواویان بەدەست هێنا.

حزبی کۆنگرەی گاندی شاڵاوێکی تیرۆریستی زۆر جیاوازتری بەکارهێنا دژی بەریتانیا بۆ ڕزگارکردنی بەریتانیا. ئەمە ئەوە دەردەخات کە بە پێی گۆڕانی



بارودۆخە سیاسییەکە تاکتیك و ستراتیژیەتەکانیش دەگۆڕێن، بارودۆخی هیندستان زۆر جیاوازتر بوو لە بارودۆخی فەرەنسا. شاڵاوی ناتوندوتیژی لە فەرەنسا شکستی هێنا بەڵام بە پێچەوانەوە لە هیندستان شاڵاوی توندوتیژی شکستی هێنا. ئەویش چەند هۆکارێکی هەبوو:

یەکەم: زۆرینەی هیندییەکان بە هۆی بیر و باوەڕی ئایینییانەوە توندوتیژیان ڕەتدەکردەوە و، شاڵاوی توندوتیژانە دەبووە هۆی لە دەستدانی پاڵپشتی خەڵکی هیندستان بۆی.

دووەم: خەڵکی بەریتانیا بە گشتی چێژیان لە دروستکردنی ئەو خەیاڵە وەردەگرت کە ئەوان لە ڕاستیدا خزمەت بە گەلی هیندی دەکەن ئەگەرچی حوکمڕانیشیان دەکەن، لە ڕاستیدا حوکمڕانیکردنی بەریتانیا بۆ هیندستان لە چەندین ڕووەوە یارمەتیدەر بوو بۆ گەلی هیندی.

ئەگەرچی حوکمڕانی کردنی بەریتانییەکان بۆ هیندستان ڕەوا نەبوو، بەڵام حوکمێکی دڵڕەقانە و دڕندانەش نەبوو هەروەها گەلی بەریتانیا لەو باوەڕەدا بوون کە حوکمڕانیکردنی بەردەوامی بەریتانیا بۆ هیندستان لە بەرژەوەندی هەردوولا دایە، لە کاتێکدا گاندی هەوڵی دەدا، کە بۆیان بسەلمێنێت ئەم بۆچوونەیان ڕاست و درووست نییە.

هەر بۆیە تیرۆریزمی نا توندوتیژی گرتەبەر، لەبری خۆ حەشاردان، خۆی و سەرکردەکانی بزووتنەوەکەی کردە ئامانجی دیار و لەبەر چاو، ئەو ڕازی بوو هەموو کردارێکی توندوتیژی و تۆڵەسەندنەوە ئاراستەی خۆی بکرێت لەبری گەلەکەی، دەیزانی کە بەریتانییەکان لەوە بەرزترن دەستگیری بکەن و بێ دادگایی کردن بیکوژن.

لە دەرئەنجامی کۆتاییشدا گاندی لەچاوی گەلی بەریتانیاوە وەك نموونەیەکی باڵای ئەخلاقی سەیر دەکرا و، دەیانوت گەر پیاوێکی جوامێر و ڕەشت بەرزی وەك گاندی وا بیر دەکاتەوە کە ئێمە ئازاری گەلی هیندی دەدەین ئیتر چۆن دەتوانین بمێنینەوەوە پێویستە وڵاتەکەیان بە جێبهێڵین؟ ئەو کاتەی گەلی بەریتانیا ئەم پرسیارەیان لە خۆیان کرد گاندی جەنگەکەی بردەوە.

کاتێك بەریتانیا بینی کە بەریتانییەکان توندوتیژی و زەبر و زەنگ دژی هیندییەکان دەگرنەبەر و گەلی هیندیش بەم چەشنەی ئەوان وەڵام ناداتەوە. ئەوا ئەو وێنەیەی بەریتانییەکان لە بارەی خۆیان دروستیان کردبوو وەك گەلێکی بەڕێز و خاوەن ڕەوشتی بەرز تێکشکا.

لە ڕاستیدا گاندی توندوتیژی بەکارهێنا، بەڵام توندوتیژییەك دژی خۆی. لەبری کوشتن، ئەو هەڕەشەی خۆکوشتنی کرد، ئەو مانگرتنی لە خواردن دانەهێنا بەڵکو تەواوتری کرد. هەرچەندە مانگرتن لە خواردن لە سایەی بارودۆخێکی زۆر تایبەتدا کاریگەر دەبێت، زۆر جار شکست چارەنووسی دەبێت.

مارتن لوتر کینگ لەساڵی ١٩٦٠ دا لە باشووری ئەمریکا تیرۆریزمی ناتوندوتیژی بەکارهێنا، بەڵام ئامانجەکانی جیاوازتر بوون. دیسان ئەمیش شاڵاوەکەی بە پێی بارودۆخە سیاسییە ناوچەییەکە ڕێکخست، بۆ سوود وەرگرتن لەو ناکۆکییە سیاسییەی لە نێو سپیپێستەکانادا هەبوو. ئەو پێشبینی ئەدەکرد سپیپێستەکانی باشوور ئارەزوومەندانە کۆتایی بە سیستەمی جیاکاری بهێنن، بەڵکو ئامانجی ئەوە بوو سپیپێستەکانی باکوور و باشوور بخاتە ململانێیەوە بۆ ئەوەی هێز و ووزە دەسەڵاتیسپیپێستەکانی باکور بۆ کۆتایی هێنان بەو سستەمە بخاتە گەڕ.



کینگ هەر وەك گاندی باوەڕی وا بوو باشترین ڕێگە ئەوەیە ڕکابەرەکانت ناچار بکەیت بە چەشنیٚ ڕەفتار بکەن کە وەك شەڕانگێز دەربکەون، بۆ ئەوەی هاوسۆزی جیهانی دەرەوە بەدەست بێنیت. چەندین جار کینگ زیندانی کرا، بەڵام هەر کاتێك ئازاد دەکرا بە هێزێکی زیاتر و باوەڕێکی پتەوترەوە دەردەکەوت.

هەر کاتێك پۆلیسەکانی باشوور لە خۆپیشاندانە ناتوندوتیژییەکانیان دەدا سوکایەتیان پێدەکردن، ئەوا بزووتنەوەکەی کینگ زیاتر بەهێزتر دەبوو. هەروەك گاندی کینگ باوەری وابوو کە دەستگیرکردنەکەی کوشتنی بەدوادا نایەت؟ کرداره تیرۆریستە ناتوندوتیژییەکانی (خۆپیشاندانەکان و، بەجیٚ نەهێشتنی قوتابخانە و کارگەکان تا وەڵامدانەوەی داواکان) گەورەتر و کاریگەرتر بوون کاتێك خەڵکێکی زۆرتر پەیوەندییان کرد بە ئاپۆڕای خۆپیشاندانەکانەوە.

بەڵام دەبزای کاتێك سەردەکەوێت کە سپیپێستەکانی باکور بێت و پەیوەندی بکەن بە هێزەکانیەوە. دەشیزانی درەنگ یان زوو ئەم خواستەی هەردێتەدی. لە کۆتاییدا توانی ئەخلاقی سیاسی زۆرینەی سپیپێستەکان بوروژێنێت تا دەسەڵاتی یاسادانانیان بەکاربهێنێت لە پێناو ناچارکردنی ویلایەتەکانی باشوور تا داواکارییەکانی جێبەجیٚ بکەن. تا ئەو ڕادەیەی حکوومەتی فیدراڵی هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزی چەکداری کرد.

پێش ئەوەی کینگ دەست بە ململانێکەی بکات، سەرۆك ئەیزنهاوەر دوای دەرچوونی بڕیاری دادگای باڵا ، سوپای ئەمریکایی (هێزە چەکدارەکانی) بەکار هێنا بۆ ئاوێتەکردنی قوتابخانەکان وەك جێبەجیٚ کردنێك بۆ بڕیارەکەی دادگا؟

لەگەڵ دەرچوونی یاسای مافەکان و یاسای مافە مەدەنییەکاندا لە ساڵی ١٩٦٤، جێبەجیٚ کردنیان ئیتر تەواوی هێزی ویلایەتە یەکگرتووەکان بووە پاڵپشتی بزووتنەوەکەی کینگ؟ ململانێکە بەردەوام بوو، دیوارەکانیش بە هێواشی و لە

سەرخۆ دەکەوتن، بەڵام ئێستا باری ڕەشپێستەکان زۆر باشترە وەك ئەوەی لە ساڵی ١٩٥٥ هەبوو، بەرەو پێشچوونی بارودۆخەکەش بەردەوامە.

بەڵام بەداخەوە باجی ئەم بزووتنەوانە لە دەستدانی گیانی گاندی و کینگ بوو، چونکە ئەوان بە ئاشکرا ڕۆڵیان لە سەرکردایەتی کردنی شۆڕشەکانیدا دەگێڕا و خۆیان کردبووە ئامانجێکی بەردەستی کوشتن و لەناوبردن. بەڵام سەربازانیش لە جەنگدا گیانی خۆیان بەخت دەکەن و، تیرۆریستانیش لەم یاسایە بەدەر نین.

من وا بیر دەکەمەوە دەبێت ئەوە ڕاستییە زۆر ڕوون بێت کە تیرۆریزم نەخشە و پلاندانانە نەك کردارێکی نا ئەخلاقی بێت، بەڵام ئەمە هەموو جارێك ڕاست نییە. هەندێ جار تیرۆریزمی بە زەبر و زەنگیش دەکرێت لە ڕووی ئەخلاقی ڕاست و دروست بێت، من گومانم هەیە کەسێك بتوانێت ئیدانەی ماکویسەکان بکات ئەگەرچی بوونە هۆی لە دەستدانی گیانی هەزارەها کەس لە ماوەی جەنگەکەیاندا. بە دڵنیاییەوە ئێمە ڕێز لە کینگ و گاندی دەگرین وەك دوو نمونەی باڵای ڕوشت بەرزی.

هەندێ جار شاڵاوێکی تیرۆریستی توندوتیژ بەرپا دەکرێت بۆ بەرگرتن لە ڕوودانی نەهامەتیەکی گەورەتر لە چاوی ئەوانەی سەرکردایەتی شاڵاوەکە دەکەن. وای دابنێ تۆ بەرەنگاری شاڵاوێکی تیرۆریستی دەبیتەوە؟ چۆن دەتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنیت؟ وەك هەر شێوەیەکی تری جەنگ، تەنها سێ ڕێگات لەبەردەمدایە، ڕازیکردن (سازشکردن)، لەناو بردن، ورە پێ بەردانی دوژمنەکەت.

بەڵام تێکشکاندنی ورەی تیرۆریستان کارێکی یەکجار سەختە و بە دەگمەن تیایدا سەردەکەوین. لەناوبردنیشیان کارێکی ئاسان نییە. کەچی تا ئێستاش ئەو وڵاتانەی بەرەنگاری شاڵاوی تیرۆریستی دەبنەوە هەردوو ڕێگەی لەناوبردنی بزووتنەوەکە و وەشاندنی گورز لە ورەی تیرۆریستان دەگرنەبەر.



ڕەنگە ئەمەش بە هۆی سروشتی ناسازانی تیرۆریزمەوە بێت، کە سەرکەوتنی بەندە بە وروژاندنی ڕکابەرەکانەوە کە بە کرداری تۆڵەسەندنەوە هەڵسن. لە هەر شەڕێکدا ئامانجی تۆ تێکشکاندنی هێزەکانی دوژمنە، چونکە بێ تێکشکاندنی ئەو هێزانە هەرگیز ناتوانین سەربکەوین.

لە ڕاستیدا ئەمە بە زۆری لە جەنگدا بەرجەستە دەبێت ئامانجی تۆ داگیرکردن و دەست بەسەرداگرتنی زەوی نییە، بەڵکو شکستهێنانە بە هێزە چەکدارەکانی دوژمن، دەتوانین دەست بەسەر خاکەکەشیدا بگرین. بەڵام گەر هێز و سوپای مابوون، داگیرکردنی زەوی کارێکی باش نییە.

ئێستا وڵاتان ئەو بیروباوەڕیان هەیە کە ئەگەر بەرەنگاری توندوتیژی بوینەوە ئەوا پێویستە بە توندوتیژی وەڵامی بدەینەوە، بەڵام خواستی تیرۆریستان ئەوەیە تۆ کاردانەوەیەکی توندوتیژانەت هەبێت، چونکە ئەوکاتە ئەوان سەردەکەون. کارێکی یەکجار سەختە هەوڵی بنەبڕکردنی هێزەکانی بدەین، گەر هاوسۆزی و پاڵپشتی خەڵکی بۆ تیرۆیستان کەم نەکەینەوە، تیرۆریستان لە شێوەی پۆل پۆل خۆیان ڕێکدەخەن و کرداری هەواڵگری لە دژیان کارێکی پڕمەترسی و لەسەرخۆیە و لە ئاستی پێویستدا نییە.

چونکە بە مانەوەی تەنها یەك شانەش، ئەوا ئەگەری سەرهەڵدان و دروستبوونەوەی شانەی دیکەش ئەگەرێکی ڕاستەقینەیە بە هۆی پەیوەندی کردنی ئەو خەڵکانەی هاوسۆزییانن بە ریزەکانیانەوە. تیرۆریزم نەخۆشییەکی سەختە کە پێویستە لە ناوی بەرین.

لەوانەیە هەندێجار لە ڕێی گفتوگۆوە بتوانین، هەڵوێستی تیرۆریستەکان بگۆڕین، ئەویش بە جێبەجێ کردن و هێنانەدی هەندێ لە داواکارییەکانیان نەك

هەمووی، بە ئومێدی ئەوەی دەست لە ململانێکە هەڵگرن. (بەڵام گرفتەکە ئەوەیە هەندێ جار زیاتر هانیان دەدات).

ئەمە وامان لێدەکات باس لە شالاوی فەلەستینییەکان بکەین لە دژی ئیسرائیل، کە بۆ ماوەی پەنجا ساڵە بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ بەردەوامە. با لە دیدی نەتەوەییەکی فەلەستینییەوە سەیری بارودۆخەکە بکەین، بەڵام دەبێت لە بیرمان بێت کە ئەو لە گۆشەنیگایەکی جیاوازترەوە بۆ شتەکان دەڕوانێت، کە ڕەنگە هەڵە بێت.

بەڵام ئەو بە پێی ئەو بیروباوەڕی هەیە بڕیاری شەڕکردنی داوە، لەبری ئەوەی بیر لەوە بکەینەوە بیروباوەڕەکەی ڕاستە یان هەڵەیە دەبێت هەوڵبدەین لێی تێبگەین، چونکە گەر وا نەکەین ئەوا نازانین چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەین.

کەواتە با وەك فەلەستینییەك بدوێین:

لە ساڵی ١٩٤٠ ئێمە و خەڵکانی ئێمە خاوەنی خاك و نیشتیمان بووین، ئەورووپییەکان بە ژمارەیەکی یەکجار گەورەوە کەوتنە جوڵە، تا لە ساڵی ١٩٤٨ دا دەسەڵاتیان گرتە دەست و ئێمەیان لە خاکی خۆمان دەرکرد.

کاتێك لەبەر هەر هۆیەك بێت وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا ئاشتیەکی ناعادیلانەیان بەسەرماندا سەپاند، ئێمە هەوڵماندا خاکی زەوتکراوی خۆمان لە دەستی داگیرکەران بسێنینەوە کە دزیبوویان.

ئەمریکا و بەریتانیا لە بەرانبەر جولەکە هەستیان بە تاوان دەکرد بە هۆی چەند ڕووداوێکەوە کە هیچ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نەبوو، بەڵام لە کۆتاییدا ئێمە سزادراین. لە دەرئەنجامدا ئەوان لە باشترین زەویدا نیشتەجێ بوون و ئێمەش لە ناو خێوەتگاکاندا ژیانمان بەسەر دەبرد. لەو کاتەوە ئەوان زیاتر و زیاتر دەوڵەمەند دەبن و



ئێمەش زیاترو زیاتر هەژار دەبین. منداڵەکانمان بە هۆی نەخۆشی و برسێتیەوە دەمرن و، زۆر ڕەشبینین بەرانبەر بە ئایندە بە گوزارشتێکی دیکە ئێمە ڕقمان لێیانە.

کەواتە ئەمە جیهانبینی ئەوە، کە هەندێ ڕاستی تێدایە و نکوڵی لێناکرێت، دەتوانین بڵێین ململانێی ئایینی دوورودرێژ و کینە ڕەگەزییەکان و شکۆدارکردن و بە پیرۆز ڕاگرتنی شەهیدان لە لایەن ئایینەوە هەموو ئەمانەن ناکۆکیەکانیان قوڵتر کردۆتەوە، پاڵنەری بەرگریکردنیان بەهێز کردووە. فەلەستینییەکانیش تەسلیم نابن و چۆك دانادەن، باوەڕم وایە کە ئەوان ئیتر داوای هەموو زەوییەکانیان ناکەنەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە داوای هەندێکیان دەکەن لەبەر ئەوەی تاسەر ناتوانن لە کەمپی پەنابەراندا بژین. ئەوان ئەوەیان دەوێت کە ئێمە دەمانەوێت. ئایندەیەکی گەش بۆ منداڵەکانیان. وەك هەموو باوانێك ئەوا هەر چییان لەدەست بێت دەیکەن لە پێناو منداڵەکانیاندا.

کەواتە ئێستا ڕوونە، کە ئیسرائیل ناتوانێت ئەم توندوتیژییە بنەبڕبکات. چونکە پەنجا ساڵە هەوڵدەدەن کەچی هێشتا سەرنەکەوتوون. کاتێك باردووۆخەکە لەبار بێت پاڵنەرەکانی تیرۆریستانیش ئامادە دەبن، حاڵی حازر پێنج لایەنی سەربەخۆ دژی ئیسرائیل لەبەرهەڵستیدان، ئەگەر هەمووشیان بدۆزینەوە و لەناویان بەرین، ئەوا لەجێی ئەوان کەسانی دیکە سەرهەڵدەدەن.

فەلەستینییەکان ناتوانن بەرگەی بارودۆخەکە بگرن، زۆرێك لە فەلەستینییەکان باوەڕیان وایە بۆ باشترکردنی بارودۆخەکە دەبێت ململانێی چەکداری بکەن. ئیسرائیل بۆ هەر هێرشێکی تیرۆریستی کە دژی ئەنجام دەدرێت، تۆڵە لە دەسەڵاتدارانی فەلەستینی دەکاتەوە. هەستێك لە ئیسرائیلدا باڵادەستە ئەویش ئەوەیە گروپە تیرۆریستییەکان لە ژێر باڵی دەسەڵاتدارە فەلەستینییەکاندا کار دەکەن، ئەوانیش دەتوانن جڵەویان بکەن.

ئیسرائیل دەبێت سازش بکات، تەنها ئەو کاتە ململانێکە کۆتایی دێت کە زۆرینەی فەلەستینییەکان ئاشتی بە بەدیلێکی لەبارتر بزانن وەك لە ململانێکردن کە ئومێدیان بە ژیان زاڵ بێت بەسەر حەزیاندا بۆ مردن. لەناوبردنی تیرۆریستان کارێکی کردەنی نییە، ناتوانین فەلەستینییەکانیش فریو بدەین کە ململانێکردن بێ سوودە.

تەنها سازشکردن کۆتایی بەم ململانێیە دەهێنێت (سازشکردن) وشەیەکی خوازراو نییە، بەڵام تاکە ڕێگا چارەی ئاشتییە ، حکوومەتی ئیسرائیل لەبەر زۆر هۆ ناتوانێت سازش بکات، لەوە ناچێت دەنگدەرە ئیسرائیلیەکان ئەم بەدیلە (سازشکردن) پەسەند بکەن.

هەردوو لایەنی ململانێکە دەرکیان بەو ڕاستییە کردووە کە ناتوانن بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ شکست بە بەرانبەرەکەیان بهێنن، هەر بۆیە هەردوولایان چاویان لە یارمەتی وڵاتە دەرەکییەکانە. لە ماوەی پەنجا ساڵی ڕابردوودا فەلەستینییەکان توانیان سێ جار دەوڵەتە دراوسێ عەرەبەکانیان قەناعەت پێ بکەن کە هێرش بکەنە سەر ئیسرائیل، بەڵام هەر سێ هێرشەکە شکستی هێنا، لە ساڵی ١٩٧٣، هیچ هێرشێکی دیکە نەکراوەتە سەر ئیسرائیل، پێناچێت لە ئایندەشدا کەس ئەم سەرکێشیە بکات.

حاڵی حازر گروپە تیرۆریستە فەلەستینییەکان بەردەوام هێرش دەکەنە سەر ئامانجەکانی ئیسرائیل و ئیسرائیلیش بەردەوام تۆڵەیان لێدەکاتەوە.

من هیچ ڕێگایەك بۆ دەرباز بوون لەم بارودۆخە نابینم، هەربۆیە باوەڕم وایە تا ئاییندەیەکی دوور هەر بەردەوام دەبێت و هیچ لایەنێك ناتوانن سەرکەوتوو بن، هیچ لایەنێکیش دەست لە ململانێکردن هەڵناگرێت و، ئاستی قوربانی و کوژراوەکان بەرەو هەڵکشان دەچێت.

http://www.electricminds.org

## سروشتی تیرۆریزم و چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی لە داهاتوودا

**بۆب چێرنۆ**

**و: مەڕوان کاکڵ**

بۆ ئەوەی لەگەڵ تیرۆردا بجەنگین، دەبێ ئەوە بزانین کە چ هانی تیرۆر دەدات، هەروەها دەبێ بە باشی ئاشنای سروشتی توندڕەویی تیرۆریستان بین. جگە لەمەش پێویستیمان بەوە دەبێ کە خواستی نوێ لە تیرۆردا دەربخەین. چونکە تێگەیشتن لە جیاکەرەوە و تایبەتمەندێتی تیرۆریستان و ئاشنابوون بە وردەکارییەکانی جیهانی ئەوان، بە ئاسانی هەنگاوەکانمان بەرەو ئەو ڕێچکەیە پەلکێش دەکات، کە لە ئاکامیدا دەتوانین بۆنی ئەو ڕۆژە بکەین تیرۆریستان لاواز و پووکاوەن. هەروەك (سۆن تزو) لە "*هونەری جەنگ*"دا دەڵێت: ئەگەر تۆ نەدوژمنت و نەخۆت نەناسیت، ئەوا لە هەموو جەنگێکدا دەدۆڕێیت.



تیرۆر، بریتییە لە چالاکی بێ هێز دژی بەهێز. تیرۆرستان بڕوایان وایە دەتوانن پەشێوی و ئاڵۆزی لەنێو خەڵکی مەدەنیدا بنێننەوەو بەوە نیشانی بدەن کە دەسەڵاتی حکوومی وەك دامەزراوەکانی کار یان دەزگا ئایینییەکان ناتوانن ئارامی دابین بکەن، گرنگتر لەوەش، دەبێ بزانین کە کاردانەوە لەگەڵ تیرۆردا قوربانی گەرەکە و، زاڵبوونیش بەسەر ئەو کاردانەوەیە قوربانی دیکەی دەوێت. قوربانییەکان، تیرۆریزم و بزووتنەوە یاخیبووەکان بەهەمان شت لە قەڵەم دەدەن، لە ڕاستیدا بزووتنەوەی یاخیبووان لە ئەوەی دی جیاوازە، چونکە گەریلاکانی بزووتنەوەی یاخیبوو بواری ڕووبەڕووبوونەوە یاخود ئەو هێرشەی کە لە بەرژەوەندی خۆیاندا بۆ سەر دەسەڵات ئەنجامی دەدەن، زۆر زیاترە لە تیرۆریستان.

ئەڵمانییەکان، بە دڵنیاییەوە، ئەندامانی بەرگریکارە فەرەنسییەکانیان وەك تیرۆرست ژمارد. بەهەمان شێوە ئێمەش لە وڵاتە یەکگرتووەکان (ڤایێت کۆنگ)مان وەها ناوزەد کرد و، تیرۆریستەکانی نێو تونێڵەکان کە بەرگری داگیرکاری ئەڵمانیان کرد و فەڵەستینییە خۆکوژەکانیش هەر هەمان ناویان لێ نرا.

جیاوازییەکە وەك ئەوەی کە من دەیبینم، یاخیبووان زیاتر ئامانجی بەرگریکارانەیان هەیە و، مەرامی کۆتاییشیان بریتییە لەوەی دوژمنەکانیان هەرێمەکەیان بۆ چۆڵ بکەن، بەڵام ئامانجی تیرۆریزم جیاوازە، بەوەی تەنها ئامانجی سەربازی نین، بەڵکو بریتییە لە نانەوەی ئاژاوەو پەشێوی کۆمەڵایەتی، ئەویش نەك بەهۆی هێزەوە، بەڵام لە ڕێگەی خۆڵقاندنی نائارامی لە کۆمەڵگادا، ئەنجامی دەدەن.

بەلای یاخیبووانەوە، هێزی گەورەو کاریگەر لە چەکدا خۆی دەبینێتەوە، بەڵام تیرۆرستان لەوانەیە سەرچاوەی ئاو ژەهراوی بکەن، یان هێماو ڕەمزە گرنگەکان بتەقێننەوە، وەك پنتاگۆن یان کۆشکی سپی. ئامانجی یاخیبووان بەدەستهێنانی

ڕای گشتی و سۆزە بۆ کێشەکەیان بەڵام تیرۆرستان دەیانەوێت لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی ترس و دڵەڕاوکێ لەنێو خەڵکیدا دوژمنەکانیان ملکەچ پێ بکەن بۆ بەجێهێنانی داواکارییەکانیان. هێزی سەربازی ئەمریکی بەئاسانی دەتوانێ بەشێوەیەکی ئاسانتر ڕووبەڕووی دوژمنێکی ناسراو بێتەوە کە هێزەکەی لە ناوچەیەکی دیاریکراو چڕ بووەتەوە. لەم بارەدا بەسەرکەووتویی کۆنترۆڵی ئاسمان دەکات و تیایدا دەتوانێ تەواوی هێزی خۆی بەکاربێنێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنەکەی... ئەوەی ئەمریکا بەرانبەر بە کردارەکانی تیرۆریستان ئەنجامی دەدات، وا بەباشی لە دژی بزووتنەوە یاخیبووەکان ئەنجامی نادات. زۆرجار هەواڵگەری، بزووتنەوە یاخیبووەکان دەخاتە فشارەوە، لەبری ئەوەی تێگەیشتنێك بەدەستبهێنێت کەچی هانی دوژمنان دەدات بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان... ئێمە چارەسەرێکی خێرامان دەوێت، کە زۆر جار ئارامگرتن باشترین چارەسەرە. لە ڕاستیدا هێرشکردنە سەر تیرۆرستان کارێکی سەختە، وەك ئەوەیە بتەوێ بەری ڕۆژ بە بێژینگ بگریت.

**ئایا ئابلۆقەدانی تیرۆریزم باشترین کارە ئەنجام بدرێ؟ ئایا ئەمە زیاتر واقیعییە لەوەی کە ڕیشە کێش بکرێ؟**

بە بڕوای من کارکردن لەگەڵ ((ئێریك هۆفەر)) دەستپێکردنێکی باش دەبێ بۆ تێگەیشتن لەوەی کەچی هانی تیرۆرست یان توندڕەوان دەدات. هۆفەر، بەدرێژی لەسەر ((بڕواداری ڕاستەقینە)) دەدوێت، بەچەشنێك کە ئەو بۆچوونانەی لەبارەی هاندانی بڕوادارنی ڕاستەقینە خستویەتیە ڕوو، بە دڵنیاییەوە ئەمڕۆ ڕاستە.

هۆفەر بڕواداری ڕاستەقینەی بەشێوەیەك پێناسە کردووە کە دڵسۆزییەکی لە ڕادە بەدەری هەیە، ئامادەیە قوربانی بۆ هۆکارە پیرۆزەکان بدات. بەگوێرەی ئەم پێنایەسە توندڕەوە ئاینییەکان و نەتەوەییەکان دەچنە ئەم چوارچێوەیە. ئەم گروپانە



پشتیوانی پێشینەی خۆیان لە خەڵکێکەوە بۆ هەمان زنجیرەی بیروباوەڕ نیشانداوە. بەڵام ئەوانەی کە بە پاڵەوان ناویان دەبەین بەلای هۆفەرەوە لەم چوارچێوەیە بەدەرن... وەك پیاو و ژن کە لەژێر فیشاردا ژیانیان دەخەنە مەترسی بۆ ئازاد کردنی هاوڕێکانیان، یان خەڵکی کە میدالیای شەرەفی کۆنگریسی وەرگرتووە، هەروەها ئەو سەربازانە یان ئەو یاخیبووانە کە دژی هەلێکی توندڕەوی هەر کێشەیەك دەجەنگن یان تەنها ئەرکی خۆیان بەجێ دەهێنن.

لە دوای تەنگژەی ٩/١١، تەنها چەند سەرچاوەیەکی کەم لەچەشنی بۆچوونەکانی هۆفەر بەرچاو دەکەون. من وا دەبینم کە کارەکەی ئەو ((کە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو *بڕواداری ڕاستەقینەی* نووسیوە)) پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ ڕۆژگاری ئەمرۆماندا هەیە و بەتەواوی وێنەیەکی هاوشێوەی ئێستامان دەکێشێ. *بڕوادارانی ڕاستەقینە*، بەدرێژی باس لەو خەسڵەتانە دەکات کە بزووتنەوەی جەماوەری دێنێتە بوون و توندڕەو لێیانەوە لە دایك دەبێ.

**ئەمانەی خوارەوە پێداچوونەوەیەکی بۆچوونەکانی ( هۆفەر )ن کە من جارێکی دیکە دام ڕشتوونەتەوە.**

**ئارەزووکردن لە گۆڕان:** بریتییە لەخواستی ڕاستکردنەوەی هەڵەکان لە کۆمەڵگەدا کە ڕژێمێکی کۆنەپەرستی یان ستەمکاری بەڕێوەی دەبات و دابڕانێکی قووڵ لە نێوانیاندا لە ئارادایە. توندڕەوەکان بڕوایان وایە کە هێزی ئەوەیان هەیە بتوانن کۆمەڵگا بەرەو بیرۆکەکانی خۆیان ڕاگوێز بکەن، واتا هێزی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگادا ڕوویێکی ئیجابییە بۆ گەشبینەکان نەك ڕەشبینەکان، بەبێ ڕەچاو کردنی ئاکامەکەی.

**پێویستی جێگرتنەوە:** توندڕەوەکان پێویستیان بەوە هەیە، بۆ شتێك بژین شایان بێت کە خۆیانی بۆ بەخت بکەن، کاتێك کە بڕواداری ڕاستەقینە ژیانی

خۆپەرستی خۆی بە دڵسۆزی دەگۆڕێتەوە، ئەوا بڕوا بەخۆبوونێکی یەکجار گەورە بەدەست دەهێنێت.

**ڕۆڵی زەرەر گەیاندن:** زیان گەیاندن لای هۆفەر هۆکارێکی کاریگەرە، چونکە ئەم پیاوانە ژیان و ئێستایان و داهاتوویان بە دارِماوی و بێ چارەسەر دەبینن، ئەوان ئامادەن بەهەدەر بڕۆن و لەناو بچن، بۆیە مەیل و سەربزێویان بەلای ئاژاوەو نانەوەی پەشێوییە و، ئارەزووی توانەوەی دەروونە بێ سوود و خرابووەکانیان هەیە. ١١/٩، نموونەیەکی کلاسیکی ئەم کردارانەیە.

**هۆفەر ئەمانەی بە کەمتەرخەم ناوبردووە و ئەو گروپانەشی دیاریکردووە کە لێیەوە سەرچاوەیان گرتووە:**

١ـ هەژارەکان.

٢ـ ئەوانەی لەگەڵ کۆمەڵگە ناگونجێن.

٣ـ بێ دایك و باوکان.

٤ـ کەمینەکان.

٥ـ هەرزەکاران (ئەوانەی بەشێکی گەورەی پێشکەوتنی کۆمەڵگەن).

٦ـ ئەوانەی تەم و مژاوی و لێڵن (ڕووبەرووی تەگەرەی چارەسەرنەکراو یان هەڵەی دیارینەکراو دەبنەوە).

٧ـ خوو پێوەگرتووان (المدمنون).

٨ـ کەم ئەندام یان کەم عەقڵ.

٩ـ خۆپەرستان.

١٠ـ ئەوانەی پەست و بێزاران.

١١ـ تاوانباران.



**لە ڕوانگەی هۆفەرەوە ئەو هۆکارانەی کە هانی خۆ کردنە قوربانی دەدەن بریتین لەمانەی خوارەوە:**

١ـ بۆ ئەوەی کەسێك ئامادە بکرێ بۆ قوربانیدان، دەبێ لە کەسایەتی و ناونیشانی خۆی دابماڵدرێ و، دەبێ ئەو کەسە هەموو شتێکی بخاتە لاوە، هەروەها هێز بەلای هۆفەرەوە بەشێکە لە گەورەیی، بەزەیی و، خۆڕاگری بەرانبەر بە ڕووداوەکان.

٢ـ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مردنی بێ ترس، پێویستە هەندێ جۆری خەیاڵ و وەهم لە مێشکی ئەو کەسەدا بچەسپێنرێت. بەجۆرێك توندڕەو خۆی وەك ئەکتەرێك دەبینێ وا لەسەر شانۆیە، مردنیشی وەك چالاکییەك دێتە بەرچاو کە باوەڕی پێ بهێنێت و دەبێت بەکارێکی شانۆیی.

٣ـ ئەوان بڕوایەکیان هەیە کە ژیانی ئێستا (دونیا) خەم و کەساسی و ناخۆشییە، تەنها هیوایەك بۆ داهاتوویەکی باشتر هاتنی جیهانەکەی ترە، واتە ڕووخاندن و تێکدانی ژیانی ئێستا بۆ خولقاندنی داهاتوو.

٤ـ براوادری ڕاستەقینە، بێ بیرکردنەوەو نەفامانە، بەهۆی ئارەزوو خولیاوە خۆی دەکاتە قوربانی. لە ڕاستیدا ئێمە کەمتر ئامادەین بۆ ئەوەی ئێستا هەمانە یان تیایداین بمرین، لەوەی کە ئارەزوومانە یان حەز دەکەین بمان بێت یان پێبگەین. ئایا نەفامییە کە خەڵکێك ئارەزووی مردن بکات لەپێناو کێشەیەك، ئالایەك، یان بیرێکی خەیاڵی؟ بەلای بڕوادارانی ڕاستەقینەوە نا!!

٥ـ عەقیدەو بیروباوەڕ پێویستە بۆ دروستکردنی یەقین لە دەروونی هەر مرۆڤێك، چونکە ڕاستەقینەی تەواو لە بیروباوەڕدا خۆی دەبینێتەوە، بەڵام بە لای ئەوانەوە گرنگ نییە کە لە بیروباوەڕ تێبگەن، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە بڕوا پێکراوە.

٦ـ کەسی توندڕەو هەمیشە ناتەواو و نائارامە و، خۆی ڕەت دەکاتەوەو بە ئارەزوویێکی توندڕەوانە دەیگۆڕێتەوە بۆ کێشەیەك کەوا تێیدەگات سەرچاوەی هەموو ڕاستی و هێزێکە.

**هەروەها هۆکارەکانی یەکبوونی بزووتنەوە توندڕەوەکان لەمانەی خوارەوەدا دەبینینەوە:**

١ـ رق و قینە.

٢ـ لاساییکردنەوە.

٣ـ بڕواکردن و ناچارکردن.

٤ـ سەرکردایەتیکردن (ناتوانێ لە کەشێکدا بژی کە بێ کاربێ، تەنها دەبێ سەرکردایەتی بکا).

٥ـ کردار.

٦ـ گومان.

لە ڕاستیدا هەموو بزووتنەوە جەماوەرییەکان خراپ نین و، بزووتنەوە جەماوەرییە ئیسلامی و مەسیحییەکانیش تارادەیەك باشن، کاریانکردووە بۆ گۆڕینی ئاراستەی مێژوو. هەروەها هەموو توندڕەوەکانیش شەیتان نین، بەڵام هۆفەر زانیاری و تێگەیشتنی بەنرخمان پێدەبەخشێ کەچی وا دەکات توندڕەوەکان دروست بن.

دیسان گرنگە کە تیرۆرست لە یاخیبوو جودا بکرێتەوە، هەرچەندە هەردووکیان ویستیان ئەوەیە کە دەست لە ژیانی خۆیان هەڵبگرن، بەڵام لەیەکەمیاندا، ئامانجیان بێ هێزکردن و لەرزۆککردنی بنیاتی حکوومەتە، لە کاتێکدا دووەمیان مەبەستیان بەجێگەیاندنی ئامانجێکی تایبەتە.



دیارترین بزووتنەوەی یاخیبوو، ڕاپەڕینی فەلەستینییە. لێرەدا کردارو دژەکردارەکان ڕووبەرووی یەکتر دەبنەوە، فەلەستینییەکان ڕادەپەڕن و دادەمرکێندرێنەوە، زیاتر ڕادەپەڕن، لە دووایدا خانووەکان دەڕوخێنرێن لە ئاکامی بەدواداگەڕانی یاخیبووان... منداڵان بەهۆی ئەوەی لەبەرەی ئاگردان و خۆکوژەکانیش لەنێو ئەواندا سەریان هەڵداوە، دەکوژرێن. بە لای زۆربەی فەلەستینییەکانەوە، تاکە هێز بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی حکوومەتە بەهێزەکەی ئیسرائیل بریتییە لەکاری نائومێدکردن. نموونە بۆ کاری تیرۆرستی هێرشی سوپرماسیستە سپیپێستەکان بۆ سەرشانی ئۆکلاهۆما و گازی ژەهراوی لە تونێلەکەی یابان.

**هەندێ لەو خواستانە چین کە لە تیرۆریزمدا دەیانبینین؟؟**

تیرۆر لەبزووتنەوە جەماوەرییەکاندا گۆڕانی بەسەردا دێت. بزووتنەوەکەی ئوسامە بن لادن، بزووتنەوەیەکی جیهانییە، تەنها لە ولاَتێکدا یان لە هەرێمێکدا نامێنێتەوە، لە هەموو ئەوەی کە ئێستا ناسراوە، سیستەمێکی ئابووری ئاڵۆز یان ئاڵۆزبوو، کە بەهۆی پێشکەوتوو یان کەم پێشکەوتوو بەیەکەوە بەستراوەتەوە. دەبێ ئێمە بەشێوەیەك لە تیرۆر بگەین کە بچینە ڕووی دواوەی ڕووکەشی بیروڕاکانمان. ئێمە ئوسامە بن لادن وەك بزووتنەوەیەکی ئیسلامی ڕادیکاڵی دەبینین، بەڵام لە بەشێکی دا وانییە، ڕەگێکی زیاتری لەسەر بنەمای خواستی ئازادکردنی خاکی پیرۆزی موسوڵمان (سعودیا) دامەزراوە، کە دوور بێ لە کاریگەری ڕۆژئاوا و، بنیاتنانی ئیمپراتۆریەتی سیاسی ئیسلامی کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بۆ ئاسیا پەل بهاوێت. بە دەستەواژەیەکی دیکە چی دەبێ ئەگەر موسوڵمانەکان قودس (ئیسرائیل ) داگیر بکەن؟

گروپە بەرهەڵستکارییەکانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان بەخێرایی بە ئاراستەی توندڕەوی نەشونما دەکەن، لەوانە گروپەکانی مافی ژیان و مافی ئاژەڵان و چالاکەکانی ژینگەپارێزان. لایەنگرانی ئەم کێشانەو کێشەکانی دیکەی هاوشێوەی ئەمانە بەهۆی بەگوێنەکردنی خەڵکەوە تووشی کاری تووندوتیژی بوونەوە، وەك بەرەڵاکردنی ئاژەڵ و تێکدانی کارگەی بەرهەمهێنانی فەرو و...هتد، پێشتر هێلێکیان کێشابوو لەدژی بریندارکردنی یان کوشتنی خەڵك، بەڵام ئەوە زۆری نەکێشاو دیواری قەدەغەکردنەکەی لێ هەڵگیرا... سوتاندنی ماڵ و موڵك زۆر باو بوو و لە ڕێگەی ئەنتەرنێتەوە ترسی کوشتن بڵاو دەکرایەوە لەدژی ئەو نوژدارانەی کە کرداری لەباربردنیان ئەنجام دەدا... تەندروستخانەکان دووچاری تەقینەوە بوونەوە، پزیشکەکان کوژران... سەرەڕای ئەمەش بازرگانیکردن بەدەرمانی نایاسایی و، ەك هۆکارێك تیرۆر بۆ هێشتنەوەو پارێزگاریکردن لە دەسەڵات بەکاردەهێنێ و هەروەها بۆ ووروژاندنی خواستی خەڵکی لە دژی گەندەڵی. بزووتنەوە تێکدەرەکانیش، شێوەی تازەیان دۆزییەوە، ئەویش بەکارهێنانی ئەنتەرنێت بوو کە هۆکارێکی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی و نێوخۆییشە. گروپی سەرتاشراوەکان ( کە بەزۆری توندڕەوەکان دەگرێتەوە ) دیاریترین سودمەندی ئەم بوارە بوون.

بەڵام بەهۆی تەکنەلۆژیاوە هەندێ بزووتنەوە و گروپ دووچاری پشت گوێخستن و جیهێشتن دەبنەوە، بۆ نموونە.. دەرمانی قەدەغەکردن یان حەبی قەدەغە کردنی منداڵبوون، داواکاری لەباربردن کەمتر دەکاتەوە، بەمەش تایبەتمەندانی لەباربردنیش چی دیکە نابنە نێچیری توندڕەوەکان. هەروەها ئەوەی لەتەمەنی دانیشتوانی وڵاتە پێشکەووتوەکاندا بەدی دەکرێت تیرۆریزم کاریگەری کەمتر



دەبێتەوە، بەهۆی کەمبوونەوەی ڕێژەی لاوان لەم کۆمەڵگایانەدا، بەمەش کەمتر ئەندامی نوێ دەچنە ریزیانەوە.

لەوانەیە تەکنەلۆژیا، تیرۆری داهاتوو دیاریکراوتر بەڵام کاریگەر تر بکات ئەویش لەڕێگەی چەکی بایۆلۆژی یان چەکی کیمیایی. ڕۆژئاوا ئەم جۆرە چەکانە لەبری چەکی کیمیایی تەقلیدی **١٩٩٣** پەرەپێدەدا، لە ڕاستیدا ئەو چەکانەی کە لە سۆڤیەتی پێشوو ماون و لەناو نەبراون، چەکی نوێ دروستکراوە بۆ لەکارخستنی کاریگەری فەوتێنەریان وەك فانتیل کە لەم دواییەدا ڕوسیا بەکاری هێنا، پەیمانی لۆفۆن **١٩٩٣**، ڕێگە بە بەکارهێنانی هۆکارە کیمیاییەکان دەدات بۆ دەستبەسەرداگرتنی ڕاپەڕین و خۆپیشاندانە توندو تیژەکان و چالاکییەکانی دیکەی سەپاندنی یاسا. جگە لەمانە تەکنەلۆژیا مەترسی دیکە بۆ کۆمەڵگا دەهێنێتە ئاراوە و وادەکات بەشێوەیەکی فراوانتر بەرەو ڕووی کاری تیرۆرستی ببێتەوە، لەوانەیە هێرشی ڤایرۆسی بکرێنە سەر سیستەمی تۆڕەکانی پەیوەندیکردن.. بۆیە کاتێك ئێمە لەهەندێ بواردا بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێین، دەبێ بزانین کە هێشتا پاشماوەی زیاتر ماوە کاری بۆ بکرێ بۆ ئەوەی لەدژی تیرۆردا بجەنگین.

### تێگەیشتن لە زنجیرەی بیر ( بیروباوەڕ )ی تیرۆرستان

دەبێ ئێمە لەبیری تیرۆرستان تێبگەین، هەروەها ئاگاداری ئەوەش بین کە دەیانەوێ چی لەڕوانگەی خۆیانەوە ئەنجام بدەن. لەوانەیە ئەمە تا ڕادەیەك ڕوون بێت، بەڵام ئەم تێگەیشتنە بەدەگمەن جێبەجێ دەبێت. حاڵەتی فلیپینییەکان و مالیزیا نەبێ کە لەدوای جەنگی دووەمی جیهان ئێمە لە دانیشتوان باش تێگەیشتبووین و، بەهەمان ئاراستەش کارمان کرد، تەنها ئەم حاڵەتە نەبێ کە لەم تێگەیشتنە بەدەر بوو، ئێمە یارمەتیمان لە دوژمنان دابڕ کرد، بەڵام هەوڵیشماندا

کێشەکان بەرەو ڕووی دانیشتوان بکەینەوە بۆیە ئەم بزووتنەوانە زۆر لە تیرۆریستان یاخیتر بوون.

تێگەیشتن لە دوژمن و لە خۆشت، بێ گومان هۆکارێکی یارمەتیدەر دەبێت بۆ پێشخستنی ستراتیژیەتێك کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئەو پاڵپشتی و یارمەتییەی دەگاتە تیرۆریستان. ئەوەیان خاڵێکی تا ڕادەیەك سانایە، بەڵام کۆمەڵگایەکی خاوەن ژمارەیەکی گەورە لە ڕێژەی دانیشتوانی لاو، هەرێمی بەپیت و لەبار بۆ تیرۆریزم دەخولقێنێ. لەو کۆمەڵگایانەی کە دانیشتوانیان بەتەمەنترن، ولاتێك کە هەژاری و گەندەڵی یەکجار تێدا بلاوە، یان کێشەی ڕۆڵی ئافرەت و پێگەکەی لە ئارادایە، ئەوا ئەو هەرێمە دەبێتە سەرچاوەیەکی بەپیت بۆ دروستبوونی تیرۆریستان. پێویستە ئێمە لە ئالۆزی بەرژەوەندی خۆمان بگەین، بەڵام ئەم بەرژەوەندییە خۆییە بەلاوە بنێین، بۆ ئەوەی ئامانجێکی گرینگتر دەستەبەر بکەین کە بریتییە لەوەدەستهێنانی هەستی ئارامی.

## پەرەپێدانی یەکخستنی هەواڵگەرییەکانمان

پێویستە ولاتە یەکگرتووەکان یەکخستنی هەواڵگەری پەرە پێبدات و لەوەش گرنگتر سیستەمەکانی ڕوونکردنەوەو تێگەیشتن پێشبخات کە ئەمەش چوونە نێو تۆڕە تیرۆریستییەکانی گەرەکە بۆ ئەوەی بەپلان و هاندەرەکانی تیرۆریستان ئاشنا بێت، لەڕاستیدا ئەمە ئاسان نییە، بەڵام دەتوانرێ ئەنجام بدرێت، بۆ نموونە هەواڵگری میکانیکی لەڕێگەی سەتەلاییتەوە کەمتر سوود دەگەیەنێت بە بەراورد لەگەڵ هەواڵگەری مرۆیی لەجەنگی دژە تیرۆردا. بەڵام ئەوەی کە سەختە ئەنجام بدرێ، ئەوەیە کە بەباشترین شێوە هەواڵگەری بەکاربهێنرێ.



من بڕوا ناکەم کە بەهێزکردنی ئەرکەکانی هەواڵگەری وەڵامێکی ئەوتۆ بەدەستەوە بدات زیاتر لەوەی کە پێویستی بە سیستەمێك هەیە بۆ ڕوونکردنەوەی خێرایی پەیوەندیکردن لەڕێگەی زنجیرەیەك فەرمانی گرنگی هەواڵگری کە بتوانرێ کاری لەسەر بکرێ. هەر چۆنێ بێ سیستەمی هەواڵگری ئێستامان وەها کاریگەر نییە کە دەبوو ببا، هەروەك جارێکیان (پۆگۆ) گوتی: ((ئێمە بە دوژمن گەیشتین، ئەویش ئێمەین)).

## داننان بەداوی سیاسی

پێویستە پاڵپشتی و هاندان لە کرۆکی بزووتنەوە تیرۆریستییەکان دابماڵین، ئەویش بە داننان بە کێشە یاساییەکان وەك بێ بەشکردن، هەژاری، گەندەڵی، چەوساندنەوەو دامرکاندنەوەی نەتەوەیی، زمانی نێوخۆیی و، ئایینی. بۆ نموونە کەس گومان دەبات کە یەکێك لە ڕیشەکانی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی ئیرلەندی، دوور خستنەوەی کاسۆلیك بوو لەهەموو بەشدارییەکیان لە حکوومەتدا؟ ئایا دەبێ ئێمە میسالیەتی خۆمان بۆ یەکسانی نێوان رەگەز، بەتایبەتی لە سوپادا لە ولاتێکی وەك سعودیادا جێ بەجێ بکەین؟!

من دەمەوێ ئامۆژگاری بکەم بەیەکگرتنی (مشتە کۆڵەی ئاسنین) و (پەنجەوانەی پەڕۆیین) کە شێوەیەکی سوودمەندە لە ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆریستان. سەرەتا لە ڕێگەی هەواڵگرییەوە مەڵبەندی بزووتنەوەی تیرۆریستی دیارییبکەن و هێز بەکاربهێنن بۆ هاوتاکردنی ئەم بنکەیە. بەڵام ڕەچاوی بەکارهێنانی (پەنجەوانەی پەڕۆیین) بکەن بۆ بیانوو هێنانەوەو بەیاساییکردنی بایەخ و گرنگی ئەو خەڵکانەی هاوسۆزی تیرۆریستەکانن لە ڕێگەی پێشکەشکردنی پرۆژەی وەك چاودێری تەندروستی، ئاوەڕۆ، خزمەتگوزاری ڕێك و پێك، بۆ ئەو شوێنانەی کە ئەم بنکانە تیایدان، بەواتایەکی دیکە، دەبێ گەندەڵی بنەبڕ بکرێت.

## ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕای گشتی کە تیرۆریستان لە ڕێگەی پڕوپاگەندەوە بەدەستی دەهێنن

ئەگەر بوار ڕەخسا توندڕەوێك دەربخەیت گەندەڵی كردووە، یان لە مەیدانی جەنگدا ڕایكردووە، ئەگەر بەئەنقەست ئەم بێ متمانەیی و بەرژەوەندییە كەسییەی ئەو لەلای سەركردەی گروپەكەی دەربخەیت، دەتوانی بێ متمانەیی بە درێژایی ڕیزەكانی دوژمن دروست بكەیت. دەبێ ئاگاداریمان هەبێ و لەوە دڵنیا بین كە تیرۆریستان فشاریان نەخستووەتە سەرمان بەشێوەیەك كار بكاتە سەر ئازادیمان یان بیخاتە مەترسیەوە. ئاشكرایە كە لە وڵاتە یەكگرتووەكاندا ئاسایشی نیشتیمانی و چاكخوازەكان لە FBI و CIA زۆر كاریگەرانە هاوكاری یەكتری دەكەن كە لەپێشوودا جیابوون.

دەبێ بەردەوام بین لە بەكارهێنانی سیستەمی پەیوەندیكردنی پێشكەوتوو كە لەبەردەستدان بەمەبەستی چاودێریكردنی چالاكی تیرۆریستان و، ڕێگا بدۆزینەوە بۆ شیكردنەوەی ئەوەی فێری دەبین و بیگوازینەوە بۆ دەسەڵات، كە دەتوانێ لەكاتی گونجاودا كاری لەسەر بكات.

بەكورتی كرداری سەربازی و سیاسی لە جەنگی دژە تیرۆردا پێویستە یەكبخرێ. تەكنەلۆژیای باڵاو هێزی سەربازی گرنگ لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ تیرۆردا ناتوانێ كاریگەرتر بێ بەقەدەر تێگەیشتن لە بیركردنەوەی تیرۆریست یان (بڕواداری ڕاستەقینە) و، دەبێ چوونە نێو لایەنی ڕاستەقینەی مرۆڤ بەشێكی گرنگی كارەكانمان بێ.

سەرەتا كە ئەم وتارەم خوێندەوە، پرسیارم كرد كە ئەگەر دەكرێ دەستنیشانبكرێ، ئایا بزووتنەوە تیرۆریستییەكان یان یاخیبوان لە كوێوە دێن یان دروست دەبن؟ وەڵامم ئەوە بوو كە تارادەیەك ئاسانە... ئەو هۆكارانە دەستنیشان



بكرێن كە لەنێو كۆمەڵگەدا هانی زۆربوونی تیرۆریستان یان یاخیبوان دەدەن. بۆ نموونە: دانیشتوانی نێر لە نێوان ١٦ـ ٢٢ و، بژاردەیەكی خوێنەواری بێ بەرهەمی كاركردن، یان كەسانێكی گەندەڵ كە بەبێ پێشبڕكێ ئابووری بەڕێوە دەبەن، ئەوا شێوەی سیستەمێك پێك دەهێنێ كە وزەی لاوان بەشێوەیەكی سلبی بەكار دەبات بۆ ئەوەی كۆمەڵگە بگۆڕێت.

لە كۆتاییدا، سنوور داركردنی تیرۆریستان دەبێ وەك ستراتیژیەتێكی سەرەكی ڕەچاو بكرێ، بەڵام لەكاتی دانانی هەر چوارچێوەیەك بۆیان، دەبێ ڕەچاوی ئەوە بكەین دانیشتوانی نێوخۆیی كە تەنها یارمەتیدەرن یان لایەنگرانی تیرۆریستانن، نەبن بە بەشداریكەری چالاك، چونكە سەرەكیترین باوەڕو ئامانجی تیرۆر بریتییە لەچاندنی دانی ئەژدیهاكان، نابێ ئێمەش ئەژدیهاكان بدورینەوە.

The Nature of Terrorism and Advice on Combating it in the Future

Bob Chernow

http://www.wfs.org

## ئامرازەکانی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزمی داهاتوو*

**ن: ئیریك هیرن**

**و: هێمن غەنی**

دەبێت پێشبینی چ چەشنە چالاکییەکی تیرۆریستانە بکەین لە داهاتوودا؟ ئەگەری زۆر ئەوەیە هەمە چەشنیەك بێت لەو کردار و چالاکییانەی ئێستە لە دەرووبەرماندا ڕوو دەدەن، سەرەڕای چەندین کرداری چاوەڕواننەکراوی دیکە کە ئێمە دەترسین تەنانەت هەر بیریشیان لێ بکەینەوە.

ئەمە لەوانەیە کوشتن و لەناوبردن بگرێتەوە لەگەڵ ئەو کردارانەی ڕاستەوخۆ دژی حکوومەت ئاراستە دەکرێن، پێکەوە لەگەڵ فشار هێنان بۆ سەر ڕای گشتی و بەرپا کردنی جەنگی دەروونی.

لەوانەیە شاهێدی کردەوەی خۆکوژی بین، پێکەوە لەگەڵ بەکارهێنانی چەکی کۆمەڵکوژدا، بۆی هەیە شاهیدی هێرش و زەبری هەمە لایەنە و تیرۆری سەر تۆڕەکانی ئەنتەرنێت بین.

ئەنجامدەرانی ئەو چالاکییە تیرۆرستییانە دەشێت تیرۆرستی ناسراو بن یاخود ئەو ڕێکخراوە تیرۆرستانە بن کە هێشتا دانەمەزراون و بە پێی بارودۆخ و پێویستی دادەمەزرێن.



زۆرێك لەو ئەگەرانەی ئاماژەمان پێکردن و چەندین ئەگەری دیکەش کە هێشتا هەر بیرمان لێ نەکردوونەتەوە دەکرێت بەشێك بن لە تیرۆری داهاتوو.

پرسیاری ڕاستەقینە ئەوەیە، ئایا ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم هەڕەشەیەین؟ دەمەوێت بیرکردنەوە بەو ئاراستەیەدا بوروژێنم کە چەندین ئامرازی دیکەی پێویست هەن بۆ بەرەنگاربوونەوە و، شەڕکردن لە دژی تیرۆریزم.

بەڵام دەبێت هەنگاوی یەکەمان چی بێت لەو بوارەدا؟ کوشتنی تیمساحەکان یاخود وشککردنی ئاوی زۆنگاوەکان؟

### بونیادەکانی تیرۆریزم

با لە نزیکەوە سەرنج لە پێکهاتەکانی هێرشێکی تیرۆرستی بدەین.

من تەنها جەخت لەسەر چەند لایەنێکی گرنگ دەکەمەوە.

شیوازی لە سەرەوە بۆ خوارەوە لە گشتییەوە بۆ تایبەتی دەگرمە بەر.

ئەم لیستەی دەیخەینە ڕوو دەکرێت بە جۆرێك لە بناغە و بنچینەکانی هەر هێرشێکی تیرۆرستی لە قەڵەم بدرێت.

بە سەرنجدان لە جموجوڵە ئایدۆلۆجی و ئایینی و سیاسییەکان، دەتوانین دەستنیشانی ئەو سەرچاوانە بکەین کە ڕێکخراوە تیرۆریستەکانیان لێوە سەرهەڵدەدەن لە داهاتوودا.

**ڕێکخراوی تیرۆریستی** — ڕێکخراوی تیرۆرستی هەموو ئەمانە دەگرێتە خۆی: پشتیوانە سەرەکییەکان، سەرکردەکان، نەخشەکێشەکان، چالاکییەکانی دابینکردنی سەرچاوەی دارایی و پارە و پول بە هەردوو لایەنی یاسایی و نایاساییەوە، لەگەڵ هەموو ئەو پاڵپشتە لۆجیستیانەی زەمینەی بە نهێنی هێشتنەوەی چالاکییەکان

دەرەخسێنن، هەروەها چەندین دام و دەزگای دیکە کە پێویستن بۆ مانەوە و بەردەوامبوونی ئەم ڕێکخراوانە.

هەر بۆیە زیاتر و زیاتر تۆڕی ڕێکخراوەکانمان بەرچاو دەکەوێت لەگەڵ ئەو ڕێکخراوە تیرۆرستییانەی هەڵگری هەمان بیر و باوەڕ و خاوەن هەمان کێشەن.

**نەخشەدانانی ستراتیژی** — ڕێکخراوە تیرۆرستیەکان، هەوڵ و کۆششی تەواو دەخەنە گەڕ لە ( چالاکییە بالاًکان ) دا، وەك پەرەپێدانی پەیوەندییە گشتییەکان، بەکارهێنانی ئامرازی پێشکەوتوو بۆ جڵەوکردن و ئاراستەکردنی ڕای گشتی ناوخۆی.

هەروەها هەوڵ و تەقەلای بەرفراوان تەرخان دەکەن بە ئاراستەی کاریگەری خستنە سەر ڕای گشتی جیهانی، لە ڕێی بەرپاکردنی جەنگی دەروونییەوە.

بە هەمان شێوە نەخشەدانانی ستراتیژی، مەشقی بنچینەیی و چالاکییە لۆجستیەکانیش دەگرێتەوە.

ڕێکخراوە تیرۆرستییەکان بەردەوام پێویستیان بە پەرەپێدان و پاراستنی جبەخانەی چەکەکانیانە، لەگەڵ پڕکردنەوەی پایەی جەنگاوەرەکانیان، لەم ئاستەدا دابینکردنی پێویستییە داراییەکان یەکێکی ترە لە ئەرکە سەرەکییەکان.

**چۆنیەتی ئەنجامدانی چالاکییەکان** — ڕێکخراوە تیرۆرستییەکان بۆ ئەوەی کاریگەر بن پێویستە توانای کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگرییان هەبێت. پێویستیان بە بەکارهێنانی سەرچاوە بەردەستەکان هەیە وەك ئەنتەرنێت بۆ یارمەتیدانیان لە دیاریکردنی ئەو ئامانجانەدا کە هێرشی دەکەنە سەر.



تیرۆریستان لە گەڕان و بە دواداچوونی بەردەوامدان بۆ کۆکردنەوە و بە دەستهێنانی زانیاری لە ڕێی چاودێریکردنی ئاسایی جموجوڵ و کار و چالاکییەکانی ئەو ڕێکخراوە تایبەتانەی کە ئەرکی پاراستنی ئارامی و ئاسایش دەگرنە ئەستۆ.

مەیلی ڕوو لە زیادبوونی گواستنەوەی ئەرکی پۆلیس و سەپاندنی یاسا و پاراستنی ئاسایش بۆ کەرتی تایبەت بۆی هەیە زەمینەیەکی باش بڕەخسێت بۆ گەیشتن بە زانیارییەکان لە لایەن تیرۆریستانەوە بە سوودوەرگرتن لە خاڵە لاوازەکانی ئەم کەرتە.

**تاکتیکی خۆ سازادان** — بریتییە لە نەخشەدانان بۆ کردارە تیرۆرستییەکان و هێنانە ڕیزی ئەندامی نوێ بۆ ناو ڕێکخراوە تیرۆرستییەکە، هێرشی تیرۆریستی کردارێکی ئالۆزە. "شەهید " یاخود هێرشبەری خۆکوژ بە چەندین ئەڵقە بەو کەسە چالاکانە دەورە دراوە کە هەڵیدەبژێرن و دەیکەنە بۆمبێکی مرۆیی، پاشان ڕەوانەی دەکەن بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکەی.

سەرکەوتنی هەر هێرشێکی تیرۆریستی دەوەستێتە سەر ئەو زانیارییە هەواڵگریانەی بۆی کۆکراونەتەوە بە سوود لێوەرگرتنیان لە ماوەی نێوان بە دەستهێنانیاندا تا وادەی بەکارهێنانیان.

**هَیرش دن** – لة رِوانطةى رِيَكخراوة ت ؤرستييةكانةوة ئةو هَيرشة بة سـةركةوتوو دةذمَيردرِيَـت ئةطـةر زؤرترين كوذراو و طةورةترين كاولكارى َ بكةوَيتةوة لةطةلَ سةرقالَكرد تةواوى دام و دةزطاكا رِاطةياندن بة رِووداوةكةوة.

## بونیادەکانی دژە تیرۆر

دووبارە لێرەدا، بە کورتی دەربارەی چەند هۆکارێك دەدوێم کە پێکەوە پەیوەستن لە بواری (بنچینەکانی) دژە تیرۆردا، کە بە هەمان شێوەی پێشو شێوازی لە گشتییەوە بۆ تایبەتی دەگرمە بەر.

به لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییەی کە ئەم خستنەڕووە تەواوی کێشەکەی نەخستۆتە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

**ڕای گشتی** – تیرۆریزم چەشنێکە لە جەنگی دەروونی، ئامانجی تێکشکاندن و ورە پێ بەردانی ئەو گەلەیە کە دەیکاتە ئامانجی پەلامارەکەی، لەگەڵ کاریگەری خستنە سەر ڕای گشتی جیهانی.

لەبەر ئەوە، کردارەکانی دژە تیرۆر دەبێت لەم سەنگەرە ڕاستەقینەیەوە دەستپێبکەن (کە ئەویش ڕای گشتییە).

**دەزگاکانی ڕاگەیاندن**– ئەم دەزاگایانە بایەخی تەواویان هەیە بۆ ستراتیژیەتەکانی هەردوو لایەنی تیرۆریزم و دژە تیرۆریزم.

**سەرکردە سیاسییەکان** – سەرکردە سیاسییەکان هەڵدەستن بە داڕشتنی سیاسەت و ڕێنمایی پێویست بۆ ڕێکخراو و کردارەکانی دژە تیرۆریزم.

**شارەزایان و پسپۆڕان** – ئەم توێژەش بە هۆی ئەو ڕاوێژ و لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە هەمەلایەنانەی دەیخەنەڕوو، ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لەبەرچاو ڕوونکردنەوەی بڕیارسازان و بەهێزکردنی ستراتیژیەتی دژە تیرۆردا.

**هەواڵگری** – هەواڵگریش بە دەوری خۆی گرنگیەکی میحوەری ( بنچینەیی ) هەیە لە شەڕی دژە تیرۆردا.

**کردارە تایبەتییەکان** – کردارە تایبەتییەکان بە پێشەنگی ئەو کۆششانە لە قەڵەم دەدرێن کە لە بواری دژە تیرۆردا دەخرێنە گەڕ، کە بریتین لە پرۆسەکانی ڕزگارکردن شان بە شانی پرۆسەکانی باڵادەست کردن و چەسپاندنی یاسا و پاراستنی ئاسایش و ئارامی و پرۆسە سەربازییەکان.



## ئامرازەکانی دژە تیرۆریزم

دەمەوێت ئاماژە بەو ڕاستییە بکەم کە چالاکی دژە تیرۆریزم لەگەڵ بوونی کۆمەڵگەیەکی بەهێزدا دەسپێدەکات کە سووربوون و ئیرادەیەکی بەهێزی هەبێت بۆ بەرهەڵستیکردن و بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزم.

بۆ ئەوەی بە چەشنێکی کاریگەر شەڕی دژە تیرۆر بکەین، ئەوا پێویستمان بە بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکە کە تەواوی کات و کۆششی خۆیان بۆ (ئەم کێشەیە) تەرخان بکەن.

ئەم ڕێکخستنە پێویستی بە سیستمێکی ڕێکوپێکی پەیوەندیکردنی ناوخۆیی هەیە، پێویستی بە زمانێکی هاوبەش هەیە، لەگەڵ بوونی هەستی متمانە و بەرپرسیارێتی لە نێو ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایەدا.

چالاکی دژە تیرۆریزمی کاریگەر دامەزراندنی مینبەری ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا دەخوازێت ، لەگەڵ سازدان و ئەنجامدانی ئەو مەشق و ڕاهێنانەی پێویستن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر ڕووداوێکی تیرۆرستی، دروستکردنی دەستەی تایبەتی مەشق پێکراو کە بە دەستەی سوور ناو دەبرێن.

هەموو ئەو پێشنیارە پێشکەشکراوانەی سەرەوە دەبێت لەسەر هەردوو ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی پەیڕەو بکرێن.

پێویستە ڕەنج و کۆششی بەربڵاو بخرێتەگەڕ بۆ بەرگرتن لە سەرهەڵدانەوەی هەر ڕێکخراوێکی تیرۆریستی دیکە بە هەمان ئەو خێراییەی ڕێکخراوێکی تیرۆریستی پێ بنبڕ دەکەین کە بەرەنگاری دەبینەوە، بە گوزارشتێکی دیکە، تەنها کوشتنی تیمساحەکان بەس نییە بەڵکو دەبێت ئاوی زۆنگاوەکەش وشك بکەین.

ئێستا هەوڵ دەدەین ئەو گیروگرفت و دژوارییانە بخەینە ڕوو کە لە هەر بوارێك لە بوارەکانی دژە تیرۆردا دووچاری دەبین، کە پەیوەستە بە بنچینە و بناغەکانی تیرۆرەوە.

لە خستنەڕووی پێکهێنەرە گشتییەکانی دژە تیرۆریزمدا پەیڕەوی شێوازی لە خوارەوە بۆ سەرەوە و لە تایبەتییەوە بۆ گشتی دەکەم.

## کردار (ئۆپەراسیۆن)ە تایبەتییەکان

کردارە تایبەتییەکان بە چالاکییە بنەڕەتییەکان لە قەڵەم دەدرێن لە بواری دژە تیرۆریزمدا. وەك ئاماژەدانێك بۆ ئەو هۆکارە جۆراو جۆرانەی پەیوەستن بەم بوارەوە، لێگەڕێن وەك نموونە ئەو کردارانە باس بکەین کە پێویستە ئەنجام بدرێن لە حاڵەتی ڕوودانی هێرشێکی تیرۆرستی خۆکوژیدا.

## کردارەکانی (ئۆپەراسیونەکانی) ڕزگارکردن

کاتێك کەسێکی خۆکوژ (بۆمبی مرۆیی) دەکاتە ئەو ئامانجەی دەستنیشانی کردووە بۆ هێرشە خۆکوژییەکەی، دەبێت کردارەکانی ڕزگارکردن سنوردار بکرێن بۆ کەمکردنەوەی کاریگەری هێرشەکە، سەرکەوتنی کردارەکانی ڕزگارکردن دەخوازێت ئەگەری بوونی هێرشێکی دیکە لەبەر چاو بگیرێت دژی هێزە ڕزگارکەرەکان و دەبێت ڕێ و شوێنی پێویست بۆ ئەم ئەگەرەش بگیرێتە بەر.

فریاگوزارییە پزیشکییەکان بە بەشێکی دانەبڕاو و جیانەکراوە دادەنرێن لە پلانی پاراستنی ئاسایشدا و ڕۆڵێکی گەورە دەبینن لە کەمکردنەوە و بەرتەسك کردنەوەی کاریگەرییەکانی هێرشەکە.



## ڕێ و شوێنەکانی پاراستنی ئاسایش

زیادکردنی ڕێ و شوێنە ئەمنییەکان بۆی هەیە هێرشبەرەکان ئاشکرا بکات بەر لەوەی بگەنە شوێنی ئامانجەکە. ئەمەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی زیانەکانی هێرشەکە یان بەرگرتن لە ڕوودانی، واتە پوچەڵکردنەوەی هێرشەکە. سەرکەوتوویی ڕێ و شوێنە ئەمنییەکان دەوەستێتە سەر جیاکردنەوەی ناوچەکان لەسەر بنچینەی ئەو ناوچانەی نەبووینە ئامانج و ئەو ناوچانەی پێشتر بوونەتە ئامانج تا ئەو ناوچانەی ئێستا ئامانجی تیرۆرستین.

لێرەدا پێویستە هەر ناوچەیەك ڕێ و شوێنێکی ئەمنی تایبەتی بۆ بگرینەبەر هەر لە چاودێریکردنی ئەلەکترۆنییەوە تا دەگاتە بەربەستە و پەرژینە بەرچاوەکان.

**چالاکییەکانی بەرگریکردن:** بریتین لە کردارە تایبەتییەکان دژی نەخشە و هەوڵەکانی هێنانە ڕیزی ئەندامی نوێ لە لایەن شانە تایبەتمەندەکانەوە کە پەیوەستن بە ڕێکخراوە تیرۆرستییەکانەوە. پێویستە بە بەردەوامی ئەم چالاکییانە بەهێز بکرێن و پەرەیان پێبدرێت بە هۆی پێداچوونەوە و چاوخشاندنەوە بە ڕێ و شوێن و خۆسازدانە ئەمنییەکانەوە.

کارێکی مەترسیدار کە کار دەکاتە سەر ڕێ و شوێنە ئەمنییەکان و لە بایەخ و هەستیاریان کەم دەکاتەوە، پەیڕەوکردنی هەندێ ئیجرائاتی ڕۆتینییە کە نابێت ڕێگەی بیدەین و دەبێت تادەکرێت کەمیان بکەینەوە.

**زەبری هێرشبەرانە:** کردارەکانی هێرشبردن لە بواری دژە تیرۆردا ئەو کردارە تایبەتییانەن کە ئاراستەی ئەو ئەڵقە نزیکانە دەکرێن کە کاریان سازکردن و ئامادەکردنی کەسی خۆکوژە بۆ ئەنجامدانی هێرشی خۆکوژی و هەڵدەستن بە حەشاردان و داڵدەدان و ڕێنماییکردن و دەستنیشانکردنی ئامانجەکە بۆی.

زۆرێك لە گەلان پاساوی ئەم کردارانە بەوە دەهێننەوە کە ئەمە مومارەسەکردنی مافی بەرگری لەخۆکردنە، بنەما بنچینەییەکەش ئەوەیە ئەو کەسەی هەڵدەستێت بە ڕێنماییکردن و بۆمبڕێژکردنی کەسی خۆکوژ، هەمان ئۆباڵی کەسە خۆکوژەکەی دەکەوێتە ئەستۆ و دەبێت بەرپرسیارێتی ئەم ڕەفتارەی هەڵبگرێت.

**کردارە نەشتەرگەرییەکان:** ئەم لایەنەی دژە تیرۆریزم، چالاکی دژە هەواڵگری دەگرێتەوە، لەگەڵ ئەو کردارە تایبەتییانەی بە مەبەستی تێکشکاندنی پاڵپشتی لۆجستی و کەمپ و مەڵبەندەکانی مەشقکردن ئەنجام دەدرێن. تیرۆریستان چالاکییەکانیان لە ژێر پەردەی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی، پزیشکی، کارگوزاری و تەنانەت ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانیش بەڕێوە دەبەن. کارگەی دروستکردنی بۆمب و تەقەمەنی لە ژێر هەمان ئەو باڵەخانەیەدا دۆزراوەتەوە کە وەك نەخۆشخانە و خوێندنگای پەرستیاری ناسرا بوون.

بە هەمان شێوە بەدەستهێنانی چەك لە ژێر پەردەی پاراستنی یاسایی بە پاڵپشتی حکومەت و، دابینکردنی سەرچاوەی دارایی بۆ ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان لە ژێر ناوی چالاکییە دارایی و ئابوورییە یاساییەکاندا بەڕێوە دەبرێن.

ئەوەی وای کردووە کردارە تایبەتییەکان دژی ئەم چالاکییانە سەخت و ئالۆز بێت، بەیەکداچوونی نێوان دامودەزگا مەدەنی و یاساییەکانە لەگەڵ تۆڕ و ڕێکخراوە تیرۆرستییەکاندا.



### ستراتیژیەتە هەماهەنگکراوەکان

لە گرنگترین و بنەڕەتیترین کردارە تایبەتییەکان ئەو کردارانەن کە لە پێناو کەمکردنەوە و نەهێشتنی پاڵپشتی و هاوسۆزی بۆ ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان دەخرێنە گەڕ. ئەم کردارانە هەوڵدەدەن ڕادەی ڕق و نارەزایی لای ڕای گشتی کەم بکەنەوە و، چیتر خەڵکی بە چاوی شکۆ و پیرۆزییەوە نەڕواننە کەسی خۆکوژ، ڕێگە بە چەواشەکردن و لە خشتەبردنی کوڕ و کچە لاوەکان نەدرێت بە هۆی گۆشکردنیان بە بیروباوەڕی ئایینیی نادروستەوە. جەنگی دژە تیرۆریزم لە بالاترین ئاستیدا دەبێت جەنگ بێت لە دژی چەواشەکاری و شەڕی دەروونی.

دەبێت ستراتیژیەتە درێژخایەنەکانی دژە تیرۆریزم جەنگی بەدەستهێنان و بردنەوەی عەقڵ و دڵەکان لەخۆبگرێت بۆ ئەوەی بەسەرکەوتوویی شەڕی دژە تیرۆریزم کۆتایی پێ بهێنێت.

### کردارەکانی بەرپێگرتن

لە کۆتاییدا دەتوانین کردارەکانی بەرپێگرتن و پوچەڵکردنەوە بگرینەبەر کە لە لایەن دەستەی تایبەتییەوە ئەنجام دەدرێن کە مەشقی تایبەتییان بینیوە بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ پێگە و بارەگا ڕاستەقینەکانی تیرۆریزمدا.

لێرەدا زانیاریی هەواڵگری لە ڕێی چاودێریکردنی بەردەوامی سایتەکانی ئەنتەرنێت و شێوەکانی پەیوەندیکردنی ژمارەیی بەدەست دەهێنرێن، مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە شەڕەکە ببرێتە گۆڕەپانە ڕاستەقینەکەی خۆیەوە بۆ لەناوبردنی ئەگەری سەرهەڵدانی تیرۆیستان لە داهاتوودا و، کردنەوەی دەروازەیەك بە ڕوویاندا بۆ ئەوەی دووبارە ئاوێتەی کۆمەڵگا ببنەوە.

## دەرئەنجامەکان دەربارەی تیرۆریزمی داهاتوو

بۆ مامەڵەکردن و بەرنگاربوونەوەی هەڕەشەی تیرۆریزمی داهاتوو، پێدەچێت پێویستمان بە دامەزراندنی دەستەی فرەنەتەوەی تایبەت بە ئەرکە تایبەتییەکان بێت. ئەم دەستانە بۆی هەیە هێزی دەستێوەردانی ناوچەیی لەخۆبگرێت بۆ ئامادەبوون لە شوێنی ڕووداوەکە و هێورکردنەوەی باردودۆخەکە و ئامادەسازی کردن بۆ ئەوەی شوێنەکە بدرێتە دەست دەستەی دیکەی تایبەت، هەروەها شتێکی سوودمەند دەبێت گەر یەکەی دژە تیرۆری جیهانی دابمەزرێت کە پێکەوە ڕێگاچارەکانی دژە تیرۆر لە سەراپای جیهاندا دەستەبەر دەکەن.

لەهەمان کاتدا پێویستە چەندین مەڵبەندی تایبەتمەندی جیهانی و گەڕۆك دابمەزرێت لەگەڵ دەزگاکانی کۆکردنەوەو و شیکردنەوەی زانیاری و سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوەدا.

## هەواڵگری

هەواڵگری ئامرازێکی هەستیاری پێکهاتەی دژە تیرۆرە، ئەرکی ئەم دەزگایە بەدەستهێنان و کۆکردنەوەی زانیارییەکانە.

بەهەمان شێوەی پێشوو، هەڵدەستین بە شیکردنەوەی هەواڵگری بە هۆی بەکارهێنانی نمونەی هەڕەشەی هێرشە خۆکوژییەکانەوە.

### دەستنیشانکردنی هەڕەشەکە

هەواڵگری هۆکارێکی بنەڕەتییە بۆ پوچەڵکردنەوەی هەر هێرشێکی تیرۆرستیی. هەرکاتێك هێرشبەرە خۆکوژەکە دەستنیشانکرا دەتوانرێت ڕێ و شوێنی ئەمنی سەرکەوتوو لە دژی بگرینە بەر.



لێرەدا هۆکاری کات گرنگی و هەستیاری خۆی هەیە. هەر بۆیە دەبێت پرۆسەکانی کۆکردنەوە و شیکردنەوەی زانیارییەکان خێرا بکرێن تا لە کۆتاییدا بۆ ئەنجامدانی کردارە تایبەتییەکان سوودیان لێوەر بگیرێت.

## دژە هەواڵگری

پێویستە دەزگاکانی هەواڵگری گەشە بە تواناکانی خۆیان بدەن. زانیارییە ئەمنییەکان گرنگی خۆیان هەیە بۆ ڕێگەگرتن لە تیرۆرستان لە گەشیتنیان بەو زانیارییانەی یارمەتیدەریان دەبن لە هەڵبژاردن و دەستنیشانکردنی ئامانجەکانیاندا. دەزگاکانی هەواڵگری دەبێت توانای پێشکەشکردنی ڕاو و ڕاوێژو ڕاسپاردەی دیاریکراویان هەبێت بۆ دامودەزگاکانی کەرتی تایبەت لە بواری مەترسی دزەکردنی زانیاری تا وەکو زانیارییە هەستیار و پڕ مەترسییەکان نەکەونە دەستی تیرۆرستانەوە.

زانیاریی هەواڵگری لەو دەستە و ئەڵقە ناوخۆیانەوە بە دەست دەهێنرێت کە چوار دەوری کەسی ((شەهید))یان داوە کە هەر لە بنەڕەتدا بە هۆی سەرچاوە مرۆییەکانەوە پێیان دەگەین. بەڕێوبردنی ئەو دەستە و ستافانەش کارێکی یەکجار مەترسیدار و هەستیارە.

لە زۆرێك لە وڵاتاندا، هەواڵگری پشتبەستوو بە سەرچاوە مرۆییەکان کارێکی (هونەرێکی) فەرامۆشکراوە. لەبری ئەمە چەندین ئامرازی دیکە بەکارهێنراون و بەکاردەهێنرێن لە پێناو کۆکردنەوەی زانیاریی هەواڵگریدا.

دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە مرۆییەکان لە ناو ڕێکخراوەکانی خۆماندا، لەوانە پۆلیس و فەرمانبەرانی گومرك و فەرمانبەرانی دیکەی حکومی.

ئەفسەرانی پۆلیس پێویستە بەسەرکەوتوویی ڕۆ بچنە پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیارییەوە، دەبێت زانیاری ڕاست و دروستیان هەبێت لەسەر ئەو ناوچانەی دەکەونە

سنووری دەسەڵاتەکەیانەوە بە چەشنێك یەکەم کەس بن هەست بە هەر جموجوولێکی جێی گومان بکەن کە لە ناوچەکەیان بەدی دەکرێت.

بەداخەوە بە هۆی چەندین بەربەست و ئاستەنگەوە زۆرێك لە پرۆسەکانی کۆکردنەوەی زانیاری دەوەستن و بێ ئەنجام دەبن. ئەم بەربەست و ئاستەنگانەش بەهۆی پەیرەوکردنی هەندێ رێ و شوێنی رۆتینییەوە دروست دەبن.

کردارە سایکۆلۆژییەکان بە هاوکاری لەگەڵ دەستە هەواڵگرییەکاندا نابێت تەنها دژی هەوڵەکانی ڕێکخراوە تیرۆرستییەکان بن لە بواری بەستن و و پەرەپێدانی پەیوەندی گشتیدا، بەڵکو دەبێت ئامانج لەناوبردن و لەکارخستنی توانای پەیوەندی کردنی ریکخراوە تیرۆرستییەکان بێت لە هەموو ئاستەکان دا.

ئەم جۆرە کردارانەش دەبێتە هۆی سەرقاڵکردنی تیرۆرستان بە پاراستنی ڕێکخراو و پێگەکانیانەوە، بەهەمان شێوە دەبێتە مایەی سەر لێشێواندن و بە هەڵەدا بردنیان.

## دەستەی هەواڵگری فرە نەتەوەیی

هەواڵگری ئامانجی زەبروەشاندنە لە ڕێکخراوە تیرۆرستییەکان و لە هەوڵە ستراتیژییەکانیان. گرنگترین هۆکار لەم جۆرە چالاکییەدا بریتییە لە هاوکاری و هەماهەنگی نێودەوڵەتی.

نموونەی ئەو کردارانەش وشککردنی سەرچاوەی دارایی تیرۆرستان و تێکشکاندنی جبەخانەی چەکەکانیانە.

ئاژانسەکانی هەواڵگری پێویستیان بە دامەزراندنی دامودەزگای تایبەتمەند هەیە شانبەشانی ئەنجامدانی جموجوڵی ئایینی و ئایدۆلۆجی و سیاسی بۆ دەستنیشانکردن و هەڵسەنگاندنی ئاستی خەتەرناکی ڕەگەزە توندڕەوەکان لە پێناو گرتنەبەری ڕێ و شوێنی پێویست لە دژیان، نەبوونی هاوکاری و هەماهەنگی لە نێوان ئەو ئاژانسانەی بە



کرداری بەرهەڵستیکردنی تیرۆرستان هەڵدەستن، یەکێکە لەو سەختی و دژوارییانەی لە بواری تێکۆشان لە دژی ڕێکخراوە تیرۆرستییەکاندا دووچاری دەبیتەوە.

لە کاتێکدا ململانێی تەندروست بەشێکە لە ڕێساکانی ئەم گەمەیە لەسەر هەردوو ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی، بەڵام ڕوون و ئاشکرایە سەرکەوتن لە شەڕی دژە تیرۆردا تەنها بە هاوبەشیکردن و دروستکردنی پردی متمانە بە یەکترکردن بەدەست دێت.

هەمیشە هەواڵگری جێی گومانە لە کاتی جموجوڵ و فراوانکردنی چالاکییەکانیدا. بۆ ڕەواندنەوەی ئەم گومانە پێویستە ئەم چالاکییانە لە ژێر یەك سایەدا کۆ بکرێنەوە و بەپێی بڕیاری سیاسی هەماهەنگ بکرێن و جڵەو و ئاراستە بکرێن.

شتێکی حەشاهەڵنەگرە کە کاری هەواڵگری نرخ و بایەخی خۆی هەیە لە سەرکەوتنی هەموو جۆرە کردارە تایبەتییەکاندا، بەڵام لەمە زیاتر دەبێت یەکێکی تر لە ئەرکەکانی هەواڵگری سازدانی کۆبوونەوە و چاوپێکەوتنی تایبەت بە ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕاو گۆشەنیگای جیاواز بێت.

ئاژانسەکانی هەواڵگری دەبێت چەندیان لە تواناادا بێت تێکۆشن بۆ بەدەستهێنانی لێکۆڵینەوەی تێر و تەسەل و هەمەلایەنە دەربارەی ئەو کێشەیەی دەخوازن زانیاریی ڕاست و دروست و باوەڕ پێکراویان لەبارەوە هەبێت.

دەمەوێت جەخت لە مەسەلەیەکی هاوبەش بکەمەوە لە ناو دەستە هەواڵگرییەکاندا: پێویستە ئەو کەس و لایەنانە دیاری بکرێن کە زانیارییە بەدەست هێنراوەکانیان دەخرێتە بەردەست بۆ سوود لێوەرگرتن و کارپێکردنیان.

کارێکی یەکجار گرنگە پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان دەزگاکانی هەواڵگری و بڕیارسازدان دا هەبێت، کە دەکرێت ئەم دەزگایانە ببنە ئامرازی پێشکەشکردنی ڕاوێژ و ڕاسپاردە و بەرچاو ڕوونکردنەوەی سیاسەتمەداران.

کێشەیەکی دیکە بریتییە لە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دەزگاکانی ڕاگەیاندندا. لە زۆرێك لە وڵاتاندا پەیوەندی دەزگاکانی راگەیاندن و دەزگا هەواڵگرییەکان وەك پەیوەندیەکی بەیەکداچووە؛ هەندێجار گیروگرفت سەر هەڵدەدات بە هۆی ئەو چاودێرییەی دەخرێتە سەر ئەم دەزگایانە کە ناکۆکە لەگەڵ مافی بەدەستهێنانی زانیاری و ڕاستییەکان.

هەندێك جاریش پەیوەندییەکی پڕ لە ناکۆکی لە نێوان ڕای گشتی و ئاراستەکانی هەواڵگریدا دروست دەبێت. لە کاتەکانی هەڕەشە و مەترسیدا، ڕای گشتی گوشار دروست دەکات بۆ ئاشکراکردنی تەواوی ڕاستییەکان و خستنەڕووی ئەنجامی ڕوون و پەردە هەڵماڵین لەسەر ڕووی هۆکارەکانی پشت ئەو هەڕەشە و مەترسییانە. گرفتەکە لێرەدا سەرهەڵدەدات واتە چۆن و بە چ شێوەیەك ڕاستییەکان بۆ ڕای گشتی ڕوون بکرێنەوە بەبێ ئەوەی سەرکەوتنی چالاکییە هەواڵگرییەکان بخرێنە مەترسییەوە.

## دەرئەنجامەکان دەربارەی تیرۆریزمی داهاتوو

هەڕەشەی تیرۆریزمی داهاتوو وا لە دەستە هەواڵگرییەکان دەکات کە سەنتەری جیهانی فرەنەتەوەیی دابمەزرێنن بۆ کۆکردنەوە و پاراستنی زانیاری و ڕاستییە هەواڵگرییەکان کە وڵاتە بەشداربووەکان دەتوانن بە شێوەیەکی گونجاو سوودی لێ وەربگرن، ئەمە بە شێوەیەکی سروشتی گرفتی پاراستنی سەرچاوە هەواڵگرییەکانی لێدەکەوێتەوە لەگەڵ دیاریکردنی ئەوەی چ دەوڵەتێك چەند و چۆن دەتوانێت بگات بەم زانیارییانە. ڕێسایەکی سادە پێمان دەڵێت ئەو وڵاتەی زانیاری زیاتر دەبەخشێت مافی زیاتر و دەرفەتی زیاترە بۆ گەیشتن بەم زانیارییانە.



لە ژێر گوشاری کاتدا دەبێت گەشە بە تواناکانی خۆمان بدەین لە بواری کۆکردنەوەی زانیارییەکان، بە جۆرێك هەندێك جار بەشێوەی گسکی کارەبایی دەبێت هەموو زانیارییەکانی دەورووبەرمان کێشکەین و کۆبکەینەوە. زانیارییە شیکراوەکان دەبێت بخرێنە بەردەست ئەو کەس و لایەنانەی کە وەك ڕێنمایی و ڕێبەر بەکاریان دەهێنن لە بواری کردارەکانی دژە تیرۆریزمدا.

لێرەدا پێویستە سوود لە ئەزموونەکانی رابردوو وەربگرین و هەڵسین بە ئاوێتەکردنی پرۆسەکانی بەڕێوەبردنی زانیارییەکان:

پێدەچێت پێویستمان بە کەسانی تایبەتمەند بێت بۆ شیکردنەوە و لێکدانەوەی زانیارییەکان بە هەموو زمانەکان.

بە شێوەیەکی کارا و کاریگەرانە هەواڵگری مرۆیی بۆی هەیە ببێتە سەرچاوەیەکی سەرەکی لە بواری کۆکردنەوەی زانیاریی هەواڵگریدا.

هۆکاری مرۆیی دەبێت ببێتە جێی بایەخ پێدانی سەرەکیمان.

بۆ سەرکەوتنی چالاکییەکانیان ئەفسەرانی هەواڵگری پێویستیان بە نەخشەدانانی مەبەستدار و زانیاریی ڕاست و دروست هەیە.

## بیریاران و پسپۆڕان

یەکێك لە ئامرازە لە بیرکراو و فەرامۆشکراوەکان لە بواری دژە تیرۆریزمدا، بیریارو و پسپۆڕە ئەکادیمیەکانن کە یارمەتیدەر دەبن لە خستنەڕووی گۆشەنیگا و جیهانبینی فراوانتر دەربارەی تیرۆریزم و دەتوانن هەموو گۆشە و لایەنەکانی ئەم دیاردەیە بخەنە بەر باس و لێکۆڵینەوەی تێروتەسەل کە لە قۆناغە سەخت و ڕاستەقینەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆردا سوودی لێوەرنەگیراوە و لەبەرچاو نەگیراوە.

ئەم کەسە تایبەتمەندانە دەبێت مامەڵە لەگەڵ هەڕەشە و مەترسییە ڕاستەقینەکاندا بکەن، سەرەڕای سوودوەرگرتن لە تەواوی ئەو ڕووداوە تیرۆرستییانەی لە مێژوودا ڕوویان داوە. دەبێت ئەرکیان هەوڵدان بێت بۆ پێشبینیکردنی ئاییندە و بیرکردنەوە لەو بابەت و کێشانەی تا ئێستا بیریان لێنەکراوەتەوە.

دەبێت ئەم کەسە تایبەتمەندانە ئەندامانی پێشو و ئەندامانی ئێستای دەستەکانی بەرەنگاربوونەوە و قەڵاچۆکردنی تیرۆر بن، لەگەڵ ئەو کەسانە بەشداری لە دارشتن و خستنەڕووی بیروبۆچوونەکان دەکەن دەربارەی ئەم دیاردەیە.

ئەم بیرمەند و تایبەتمەندانە بۆیان هەیە ببنە ڕاوێژکار و چاودێری ڕەخنەگر و هەڵسن بە پێشکەشکردنی ڕا و سەرنج و ڕەخنەکانیان بۆ دەستەکانی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزم. لە پاڵ پێشبینیکردنی ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی داهاتوو و بەشداریکردن لەگەڵ ئەو هێزانەی تایبەتمەندن بۆ دارشتنی ڕێگاچارەی پێویست بۆ بنبڕکردنی کێشەکە.

هەروەها دەبێت ئێمە ئەم کەسانە وەکو کەسانی خاوەن ڕا و ڕێنماییکار بناسین و قبوڵبکەین.

### دەرئەنجامەکان دەربارەی تیرۆریزمی داهاتوو

پێکهێنانی تۆڕێکی سەرکەوتوو لەم کەسە تایبەتمەند و پسپۆڕانە کارێکی یەکجار گرنگە تا بتوانن پێ بە پێی گەورە بوون و گەشکردنی ڕێکخراوەکانی تیرۆریزم ستراتیژیەتەکانی بەرپەرچدانەوە و بەرەنگاربوونەوەیان دابڕێژن.

ململانێی سیاسی و بیرۆکراسیەت زۆرجار دەبنە بەربەست و کۆسپ لەبەردەم پەیڕەو کردنی ستراتیژیەتە دارێژراو و بڕیار لەسەردراوەکان لەگەڵ ئەو کردارانەی حکومەت بە نیازە دژی تیرۆرستان ئەنجامیان بدات.



بوونی ئەم کەسانە دەبێتە هۆی سازدانی گفتوگۆی هەمە لایەنە لەسەر تۆڕەکانی ئەنتەرنێت و یەکخستنی هەوڵەکان بۆ گەڕان بە دوای ڕێگاچارەی پێویستدا بۆ کێشەکە کە ئەمەش تا دوا ئەندازە سوودمەند و بە کەڵك دەبێت. پێدەچێت پێویستمان بە پەیمانگا و دەزگاکانی لێکۆڵینەوەی هەمە لایەنە هەبێت کە کات و کۆششی خۆیان تەرخان بکەن بۆ دارشتنی ستراتیژیەتی بەرەنگاربوونەوەی جیهانی و ئامادە بن ببنە بەشێك لەو ستراتیژیەتە گشتییە.

پێویستمان بە مەڵبەندی نێودەوڵەتی ئاست بەرز و خاوەن توانست و لێوەشاوەیی هەیە کە بە هۆی لێکۆڵینەوە تێرو تەسەل و گشتگیرەکانیانەوە ڕێنمایی پێویست بخەنەڕوو بۆ چۆنیەتی ئەنجامدانی کردارە تایبەتییەکانی بواری شەڕی دژە تیرۆریزم.

نمونەش ئەو ناوەندانەیە کە بەم دواییە دامەزران بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی شەڕکەران و جەنگاوەرانی ئیسلام. هەر پەیوەست بە هەڕەشەکانی تیرۆریزمی داهاتووەوە، ئەگەری ئەوە هەیە خەیاڵی زانستی ببێتە بەشێکی پەیوەندیدار بە خۆسازدان و ئامادەسازی فیکرییەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم هەڕەشەیە لە داهاتوودا.

### سیاسەت

سیاسەت و بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزم لە پێشەنگی بەرنامەی کاری نەتەوەییەوەن لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا. دەرفەتم بدەن ئاماژە بەچەند مەسەلەیەکی بایەخدار بکەم دەربارەی ئەو ڕێ و شوێنە سەرکەوتووانەی دژی تیرۆریزم پەیڕەو دەکرێن.

ئیرادەی سیاسی: بنەڕەتیترین پاڵنەر بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکانی دژە تیرۆریزم پابەندبوونی سیاسییە. ئیرادەی شەڕکردن لە دژی تیرۆریزم و مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو جیاوازییانەی لە نێوان تیرۆریزم و تاوانی ڕێکخراودا هەیە گرنگی خۆیان هەیە بۆ بڕیارسازە سیاسییەکان.

بەڵام با واقیعی بین و جڵەو بۆ ئەندێشەمان شل نەکەین. هەندێك جار چالاکییە گومانلێکراو و جێی پرسیارەکان بەشێکی دانەبڕاون لە پێکهاتەی ژێرخانی ئابووریی وڵات. هەر بۆیە کارێکی پڕ زەحمەت و دژوارییە، هەندێ وڵات ناچار بکەین سەرچاوە داراییەکانی تیرۆرستان وشك و بنەبڕ بکەن، لە کاتێکدا ئەم چالاکییە ئابووری و داراییانە وەك بەشێکی یاسایی لە ئابووریی نیشتمانی دەردەکەون.

سەرکردایەتی: سەرکردایەتیکردنی شەڕی دژە تیرۆر لە هەر دوو ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدا کارێکی پێویستە بۆ چڕکردنەوەی هەوڵەکان و خستنەگەڕی تەواوی توانا و کۆششەکان لەو پێناوەدا.

پێناسە کردن: پێناسەکردنی تیرۆریزم لە لایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە یەکجار گرنگ و بنەڕەتییە، کە بۆی هەیە ببێتە بناغە و بنچینەیەکی یاسایی بۆ چالاکییەکانی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزم.

هەروەها دەبێتە پاڵپشتیەکی گەورە و ئامرازێکی کارا بۆ فراوانکردنی تێکۆشانمان لە دژی تیرۆریزم لە سەر ئاستی نێونەتەوەیی. چونکە تا ئێستاش زۆرێك لەو گروپ و ڕێکخراوانەی تیرۆرستان دەگرنە خۆیان، لە ژێر پەردەی جەنگاوەرانی ئازادی و یاخیبواندا درێژە بە چالاکییەکانی خۆیان دەدەن.

یاساکان: پاڵپشت بە ئیرادەی سیاسی سەرکردەکان و پێناسە نێودەوڵەتییەکان، پێویستە نەتەوەکان هەڵسن بە داڕشتنی یاسای نوێ و گۆڕانکاری و دەسکاری کردنی یاساکانی پێشوویان بۆ باشتر خۆسازدان بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو هەڕەشانەی لە تیرۆریزم و تاوانی ڕێکخراوەوە ڕووبەڕوومان دەبنەوە.



## بڕیاری سیاسی ڕوون و ڕاشکاو

لە بواری بنبڕکردنی تیرۆریزمدا دەبێت داوا لە سەرکردە سیاسییەکان بکەین بڕیاری سیاسی سەخت وەربگرن. لە کاتی نەبوونی ڕابەر و پێشەنگی سیاسیدا ڕێکخراوەکانی دژە تیرۆریزم پتر گرفتەکان بەرێوە دەبەن لە بری ئەوەی چارەسەری بکەن.

سیاسەت، هاوبەش و هاوکارێکی گرنگە لە بواری دژە تیرۆریزمدا و بەرپرسە لە کۆنترۆڵکردن و پاڵپشتیکردنی ئامرازەکانی دژە تیرۆریزم. سیاسەتمەداران نابێت تەنها ڕای گشتی بکەنە پاڵپشتی خۆیان بە هۆی سووربوون و بەرەنگاربوونەوەی سەرسەختانەی تیرۆریزم، بەڵکو دەبێت پەیامێکی ڕوون و ئاشکراش بۆ گروپە توندڕەوەکان بنێرن.

لە لایەکی دیکەوە ئێمە چاوەڕوانییەکی زیاترمان لە سیاسەتمەداران هەیە کە بە شێوەیەکی زانستیانە و پیشەگەرانە دەزگاکانی ڕاگەیاندن هەڵسوڕێنن، شەڕ لە دژی تیرۆریزمی داهاتوو ئیرادە و ئازایەتی سیاسی دەوێت، بە هەمان شێوە خەبات و تێکۆشانی بێ وچانی دەوێت، لە پێناو کەمکردنەوەی کاریگەری هێرش و پەلامارە تیرۆرستییەکان لە داهاتوودا.

هەروەها بۆ بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزمی داهاتوو دەبێت سیاسەتمەداران خاوەنی هۆشیاری و حیکمەتێکی زۆربن. پێدەچێت ڕوانینێکی ڕوونی سیاسی کارێکی پێویست بێت، دەبێت سەرکردەکانمان ڕەچاوی بارودۆخ و هەلومەرجی سەر ئەرزی واقیع بکەن لە ساتی دەرکردنی بڕیاری سیاسیدا.

## دەزگاکانی ڕاگەیاندن

زۆرێك لە زانیارییە گشتییەکان دەربارەی تیرۆریزم لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە دێن. زۆرێك لە هەواڵە جیهانییەکان تەنها جەخت لەسەر دیارترین قۆناغی چالاکییە

تیرۆرستییەکان دەکەن و تەنها ئەم لایەنەی چالاکییەکە زەق دەکەنەوە، واتە خودی هێرشە تیرۆرستییەکە، لە ڕاستیدا یەکەم کاردانەوەی هەر هێرشکی تیرۆرستی لەسەر دەزگاکانی ڕاگەیاندندا دەردەکەوێت.

با نمونەی هێرشێکی خۆکوژی باس بکەین: دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە شوێنی ڕووداوەکەوە وێنەکانی کوشتن و کاولکاری دەگوازنەوە، ئەم وێنانەش دەبێتە بەهێزترین چەکی دەستی ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان کە تیایدا ئەو خەڵکانە پیشان دەدرێن کە بوونە ئامانج، ئەمەش ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر ڕای گشتی جیهانی. ئەم وێنانە دەبنە سەلمێنەری سەرکەوتنی چالاکییە تیرۆرستییەکان، لە هەمان کاتدا دەبێتە هۆی دامرکاندنەوەی حەز و ئارەزووە نەخۆشەکانیان بۆ کوشتنی بێ تاوانەکان.

بەڵام بەرژەوەندی پشت پەردەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن چییە لە گواستنەوەی ئەم چالاکییە تیرۆرستییانەدا ؟ لە کاتێکدا ئەم گواستنەوەیە گەورەترین خزمەت بە تیرۆریزم دەکات، بە هۆی چاندنی ترس و دڵەڕاوکێیەوە.

هەمیشە دەزگاکانی ڕاگەیاندن مافی خەڵکی (جەماوەر) بۆ زانینی ڕاستییەکان دەکەنە پاساوی گواستنەوەی ئەم ڕووداو و دیمەنانە، چونکە زۆربەی زۆری جەماوەر دەیەوێت بزانێت کێ باشە و کێ خراپە، بێ ئەوەی ئەرك و زەحمەتی بیرکردنەوە بداتە بەر خۆی، دەیەوێت زانیارییەکانی بۆ ورد بکرێنەوە تا بە ئاسایی تێیان بگات بێ هیچ ئاڵۆزی و زەحمەتیەك.

تیرۆرستە هاوچەرخەکان دەیانەوێت بە ڕەنگدانەوەی کردەوەکانیان لەسەر ڕای گشتی کار لە بڕیاری سیاسی بکەن. لێرەدا دەزگاکانی ڕاگەیاندن دەبنە پاڵپشتی ئەم جەنگە دەروونییە بە هۆی نەبوونی ئەزموون و شارەزاییەوە، واتە بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن دەبنە ئامرازێك لەم جەنگەدا و بێ لایەنی و مەوزوعیەتی خۆیان لە دەست دەدەن.



هەروەها تیرۆرستان بە هۆی دەزگا ڕاگەیاندنە جیهانییەکانەوە هەڵدەستن بە گواستنەوە و گەیاندنی پەیامی خۆیان.

بەڵام دەتوانین تا ڕادەیەك لە کاریگەری ئەم شاڵاوە و شەڕە دەروونییە کەم بکەینەوە بە هۆی تێگەیشتن و بەهۆی سەرنجدان لەو پاڵنەر و هۆکارە شاراوانەی لە پشتی ئەم چالاکییە تیرۆرستییانەوەن.

ئاگادارکردنەوە و تێگەیاندنی دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەو ئەرك و بەرپرسیاریەتییەی دەکەوێتە ئەستۆیان لە بەرژەوەندی ئێمەیە، کە ئەم دەزگایانە یەکەمین وەڵام دەرەوەی پەلامارە تیرۆرستییەکانن. دەزگاکانی ڕاگەیاندن چەکێکی دوو سەرەن دەکرێت بە هەردوو بارەکەدا بەکاربهێنرێن، واتە دەتوانرێت بخرێنە گەڕ بۆ بەرپاکردنی جەنگی دەروونی یاخود بەرپەرچدانەوەی.

بە هەماهەنگی کردن لەگەڵ ئەم دەزگایانە و کێشانی سنوورێکی ڕوون لە نێوان هەڵسوڕاندنی بەرپرسیارانەی ئەم دەزگایانەو بوونیان بە ئامراز و چەکێك بە دەستی تیرۆرستانەوە، ئەوا دەتوانین بیانکەینە پاڵپشت و هاوپەیمان بۆ بەرەنگاربوونەوە و بنەبڕکردنی تیرۆریزم.

دەشێت (تیرۆریزمی ڕاگەیاندن) ببێتە بەشێك لەو تیرۆریزمەی لە داهاتوودا ڕووبەڕووی دەبینەوە، واتە دەستگرتن بەسەر کەناڵەکانی زانیاری و دەزگاکانی دا و بەکارهێنانیان بۆ بڵاوکردنەوەی ترس و لەرز و چاندنی دڵەڕاوکێ وەك جێبەجێ کردنێك بۆ ئەو نەخشە و پلانانەی پێشتر بۆ ئەم مەبەستە داڕێژراون. لەگەڵ پەخشکردن و بڵاوکردنەوەی لێدوانی سیاسیی ساختە و چەواشەکارانە، کە بە هەمان شێوە دەبێت ئەم ئەگەرەش لەبەر چاو بگرین و خۆمانی بۆ ئامادە بکەین.

هێرشە تیرۆرستییەکان بە چەندین شێواز ڕای گشتی دەکەنە ئامانج :

یەکەم: هێرشی سەرکەوتوو هەوڵی ورەپێبەردان و لاوازکردنی گیانی خۆڕاگری و بەرەنگاربوونەوەی ئەو خەڵکانە دەدات کە دەیانکاتە ئامانج.

مەرامی تیرۆرستان خولقاندنی هەستی زەبوونی و بێدەسەڵاتییە لە نێو هاوڵاتیاندا. ئەم شاڵاوە دەروونییە لە دەرئەنجامدا فشارێکی بێ شومار دروستدەکات و حکوومەت ناچار دەکات کاردانەوەی زیادەڕەوانەی هەبێت و لە ئاکامدا ببێتە هۆی سەرزەنشتکردن و ئیدانەکردنی لە لایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە.

دووەم: هێرشەکە لە لایەن تیرۆرستانەوە دەکرێتە پردێك بۆ گەیاندنی پەیامەکەیان بە هەموو جیهان، بە پێچەوانەی تیرۆریزمی پێشووە کە پەیامە سیاسییەکانیان زۆر ڕوون و ئاشکرا بوون.

ستراتیژیەتی تیرۆرستانی ئەمڕۆ دوو ڕووی هەیە: لەلایەك شەپۆلێکی ڕاچڵەکاندن و هەژاندن ئاراستەی جیهانی شارستانی دەکەن، لە لایەکی ترەوە ئەم (سەرکەوتنانە) بەکار دەهێنێت بۆ ڕاکێشانی زیاتری هاوسۆزەکانیان بۆ ((جیهاد کردن))، هەموو پەلامارێکی تیرۆرستی سەرکەوتوو نووسینەوەی لاپەڕەیکی دیکەیە لە پەرتووك و دەستنووسی تیرۆرستان بۆ ڕێنماییکردن و گۆشکردنی نەوەی داهاتوو لە توندڕەوان.

**ڕۆشنبیری گشتی:** ستراتیژیەتی سەرکەوتوویی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر هەوڵی لێبڕاوانەی ڕۆشنبیرکردن و هۆشیارکردنەوەو بەرچاو ڕوونکردنەوەی هاوڵاتیان لەخۆدەگرێت دەربارەی مەترسییەکانی زاڵبوون و باڵادەستی تیرۆرستان و مەترسییەکانی ئەو شەڕە دەروونییە بەرپای دەکەن.

**ڕێ و شوێنەکانی پاراستنی ئاسایش :** گەر پاڵپشتی ڕای گشتیمان مسۆگەر کرد ئەوا بە دڵنیاییەوە دەتوانین ڕێ و شوێنی ئەمنی توند و تۆڵ بگرینەبەر. ئەوە هاوڵاتیانن بە شێوەیەکی گشتی باجی دانانی خاڵەکانی پشکنین و بەرتەسك کردنەوەی ئازادییەکان



دەدەن. بۆیە دەبێت بایەخێکی زۆر بدرێتە ئەم بەشە گرنگەی چالاکی دژە تیرۆریزم و هەوڵی بێ وچان بدێت بۆ ڕۆشنبیرکردن و بەرچاو ڕوونکردنەوەیان.

تیرۆریزم هێرش دەکاتە سەر ورە و خۆڕاگری و هاوسەنگی هەست و سۆزی تاکە کەس، لەبەر ئەوە دەبێت هەرچی لە توانامانـدا بێت بیکەین بۆ بەهێزکردن و هۆشیارکردنەوەی ئەم پاڵپشت و شەریکە گرنگەی شەڕی دژە تیرۆریزم.

دەرئەنجامەکان دەربارەی تیرۆریزمی داهاتوو

پاڵپشتی ڕای گشتی هۆکارێکی هەستیارە بۆ هەر چالاکییەکی درێژخایەن لە بواری بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزمدا.

بە گوزارشتی دکتۆر گانۆر:

هێزەکانی دژە تیرۆر بۆیان هەیە شەڕەکە ببەنەوە و جەنگەکە بدۆڕێنن، گەر هاوڵاتیان سڵیان کردەوە لە بەکارهێنانی هۆکارەکانی گواستنەوە و هاتوچۆکردنی شوێنە گشتییەکان.

Tools for Countering Future Terrorism

Eric Herreu

http://www.ict.org.il

# سەرچاوەکانی تیرۆری نوێ

ن: ماسیۆ ج. مۆرگان

و: مەڕوان کاکل

خۆ پیاکێشانی فڕۆکە ڕفێنراوەکانی هێڵی بازرگانی بە هەریەکە لە باڵەخانەی بنکەی بازرگانی نێودەوڵەتی و پنتاگۆن لە ١١ ی سێپتێمبەری٢٠٠١دا، بە یەکێك لە کاولکارترین هێرشە تیرۆریستییەکانی مێژووی جیهان لە قەڵەم دەدرێت. بەر لەو هێرشە تیرۆریستییە کە نزیکەی ٣٠٠٠٠ کەس تیایدا بوونە قوربانی، وێرانکەرترین هێرشی تیرۆریستی تاکەکەسی توانیبووی ژیانی تەنها ٣٨٠ کەس ئاوا بکات. کارەساتەکەی ٢٠٠١ لە کاتێکدا ڕوویدا کە شارەزایان خەریکی پێناسەکردنی تیرۆری نوێ بوون بە جەختکردنەوە لەسەر ئەو دید و بۆچوونانەی کە پێشبینی هێرشی بەکۆمەڵ و تێکدەرانەیان دەکرد، بەداخەوە هێرشە کاولکارییەکە ئەم مەترسییەی ئەوانی پشتڕاستکردەوە.

(شێوازەکانی *تیرۆری جیهانی*) کە لە سەرەتاکانی ٢٠٠٢دا بڵاوکرانەوە، ئەوەی ئاشکراکرد کە لەو چەند ساڵەی دواییدا هێرشە تیرۆریستییەکان کەمتر بوونەتەوە، هەرچەندە ژمارەیەکی زۆریش لە خەڵك لەو ماوەیەدا بوونەتە قوربانی[1]. لە کۆتایی هەشتاکاندا ئاماژە بە زۆری ژمارەی هێرشە تیرۆریستییەکان دەکرا بە تایبەتی لە سەلانی ١٩٨٥ ـ ١٩٨٦، تێکڕای ژمارەی کارە تیرۆریستییەکان بەدەر لە ساڵی



١٩٩١ نەبێت بە زیاتر لە ٦٠٠ ڕووداوی تیرۆریستی خەملێنرا. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٨ بەدواوە تێکڕای ئەم ژمارەیە کەمتر بووەوە کە گەیشتە نزیکەی ٤٥٠ ڕووداوی تیرۆریستی لە هەر ساڵێکدا و، لە ساڵانی ١٩٩٦ ـ ١٩٩٨ گەیشتە نزیکەی ٣٠٠ هێرشی تیرۆریستی. ئەم ژمارەیە لە ساڵی ١٩٩٨ەوە گەیشتە ٢٧٤ هێرشی تیرۆریستی، بەڵام لە هیچ بارێکدا ئەم ژمارانە نەگەیشتنە ئاستی ئەوانەی کە لە هەشتاکاندا ڕوویاندا. لە ڕاستیدا ئەم کەمبوونەوەیە لە ژمارەی ڕووداوەکان بەرەوژێربوونەوەیەکی هێڵی (ڕێکوپێك) نەبوو لە ژمارەی زۆرەوە بۆ ژمارەی کەم، بەڵام خواستەکە ئەوەی ڕوونکردەوە کە ڕووداوەکان کەمتر بوونەتەوە، بۆیە هەرچەندە ژمارەی ڕووداوەکان کەمتر بینەوە، بێ گومان مەترسی کەمتر دەبێتەوە.

ئوسامە بن لادن و تۆڕی تیرۆریستی ئەلقاعیدەی نێودەوڵەتی گەورەترین نموونەی تیرۆری نوێن، بەڵام ئیسلامییە توندڕەوەکان تاکە شێوەی تیرۆری وێرانکردن و تێکدەرانە نین، بەڵکو ڕێکخراوی دیکەش وەك (ئۆمی شیرینکیۆ) کە ڕێکخراوێکی ئاینی یابانییە، یەکەم گەورەترین هێرشی تیرۆریستی بە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە تۆنێلی تۆکیۆ لە ساڵی ١٩٩٥دا ئەنجامدا، هەروەها تەقاندنەوەی باڵەخانەی فیدراڵی (مۆراه) لە ئۆکلاهۆما، هەمان توندڕەویی باڵی ڕاستی ئەمەریکییەکانی سەلماند، جگە لەمە پلانەکانی دیکەی کەسایەتییە تیرۆریستییە مەسیحییەکان هەمان خواستی نانەوەی قوربانی بەکۆمەڵی نیشان دا.

(نادین گۆر و بنیامین کۆڵ) تیرۆری (ناوەکی ـ بایۆلۆژی ـ کیمیاییNBC ) یان بە (شەپۆلی سێیەمی بێهێزی) لەقەڵەمدا کە لە لایەن ولاتە یەکگرتووەکانەوە لە سەرەتاکانی ١٩٩٥دا تاقیکرایەوە. دوو شەپۆڵەکەی یەکەم لە لایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە بەڕێوەچوو کە بریتی بوو لە بۆمبی ناوەکی ١٩٤٩ و، لەدوای ئەوەش

پەرەپێدانی چەکی ناوکی کەوتە قۆناغی پێشبڕکێکردن.[٢] (دێڤید ڕاپۆپۆرت) هەمان هەڵسەنگاندنی بۆ سروشتی تیرۆری هاوچەرخی هاندراو بەهۆی ئایینەوە هەبوو و، لە قۆناغەکانی نەشونماکردنی تیرۆردا بە شەپۆلی چوارەمی ناوزەدکرد کە لەدوای تیرۆری **"هەرەسی ئیمپراتۆریەت و نەمانی کۆلۆنیالیزم و دژە ڕۆژئاواییبوون"** دا هاتە ئاراوە.[٣]

کۆمسیۆنی جیهانی بۆ تیرۆر، وای بینی کە توندڕۆیی، زیاتر هانی تیرۆری ئێستا دەدات وەك ئەوەی کە بەرژەوەندییە سیاسییەکان دەیکات و، ئێستا تیرۆریستان لە ڕێگای ئەنجامدانی کارەکانیان زۆر ئازادترن لە هەرکاتێکی پێشووتردا[٤]. هەندێك سەرچاوەی زانستی دیکە گەیشتوونەتە هەمان ئاکام کە تیرۆریزم بەزۆری لەسەر بنەمای توندڕۆیی ئایینی بنیات دەنرێت[٥]. لە بڵاوکراوەکانی بەر لە ٢٠٠١ دا هۆشداری لەبارەی مەترسی تیرۆری نێو نەتەوەیی زیادی کرد[٦]، بۆ نموونە، (ئاشتۆن کارتر، جۆن دەج و، فیلیپ زیلیکۆ) لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری (فۆڕێن ئەفێیرس، ساڵی ١٩٩٨) ڕایان گەیاند کە هەڕەشەکانی تیرۆری کاولکاری بەدیارکەوتوون[٧] و بایەخەکانی پێشووتر لەمەڕ خەڵکە پەراوێزکراوەکان کە پاڵپشتی کێشەکەیان دەکرد هیچی دیکە بەلای ڕێکخراوە تیرۆریستییەکانەوە گرنگی نەماوە. لە بری جەختکردنە سەر نیازە عورفییەکانی بزووتنەوە سیاسی، یان ئایینییەکان، تیرۆری ئێستا بەدوای ئەوەن تیشکۆی ئامانجەکانیان بخەنە سەر تێکدان و ڕووخاندن و برەودان بە ئاژاوەگێڕی. یوسف بۆدانسکی لە کتێبەکەیدا (بن لادن)، لە (س. ك. مالیکس) دوە لە کتێبی (*بۆچوونەکانی قورئان لەمەڕ تیرۆر*) وەردەگرێ:

(تیرۆر و، ترس و تۆقاندن خستنە نێو دڵ و دەروونی دوژمنانەوە تەنها ڕێگایەك نییە، بەڵکو لە هەمانکاتدا ئامانجیشە. لە هەربارێکدا کە تیرۆر خرابێتە نێو



دەروونی بەرانبەرەوە ئەستەمە کە شتێك مابێ بەدەست نەهێنرێت. ئەمە ئەو خاڵەیە کە هۆکارەکان و کۆتاییەکان (ئامانجەکان) لێیەوە بەیەك دەگەن و تیایدا یەکدەگرن. تیرۆر هۆکارێك نییە بۆ سەپاندنی بڕیارەکان بەسەر دوژمناندا، بەڵکو بڕیارێکە ئێمە دەمانەوێ بەسەریاندا بیسەپێنین).[٨]

تیرۆری ئەمڕۆ لە گۆشەنیگا و، پیادەکردنی شێوازەکانیانەوە، ئامانجی کۆتاییان زیاتر تێکدەرانەیە. زۆربەی ڕێکخراوە توندڕۆکان تیرۆر بەوە لێکدەدەنەوە کە ڕێگەیەکی دیکە بێ بۆ کۆتایی هێنان بە خودی تیرۆر. کۆمسیۆنی جیهانی بۆ تیرۆر لە (ڕ. جیمس وولسی) ڕایگەیاند: **"**کە تیرۆریستانی ئیمڕۆ نایانەوێ لەسەر مێز دابنیشن، بەڵکو دەیانەوێ مێزەکە بشکێنن و ئەوەی داشنیشتووە لەسەری بیکوژن**"**.[٩]

هەندێك لە توێژەرەوان مشتومڕی ئەوە دەکەن کە گەشەسەندنی تیرۆر زیاتر بەردەوامی بەخۆوە دەگرێ لەوەی کە گۆڕانکاری بەسەردا بێت، بۆ نموونە نانەوەی قوربانی بەکۆمەڵ ماوەیەکی درێژە کە خەسڵەتێکی شێوازە تیرۆریستییەکان پێکدەهێنێ و توندڕۆکانیش هەمیشە باڵادەستی هاندەرە تیرۆریستییەکان بوون.[١٠] کتێبە نوێیەکەی (وۆڵتەر لاکوێر) هۆشداری دەدات لە دژی هەوڵدان بە هەر شێوەیەك بێ بۆ پۆلینکردن یان پێناسەکردنی تیرۆر، چونکە پێیوایە ژمارەیەکی یەکجار زۆر تیرۆر هەیە و، جەخت لەسەر تایبەتمەندێتی بزووتنەوە تیرۆریستییە جیاوازەکان و شێوازەکانیان دەکاتەوە.[١١] هەروەها چەند نەوەیەکی پەرەسەندووی تیرۆر جیادەکاتەوە بە تایبەتی ئیسلامییە توندڕەوە جیاوازەکان. جگە لەمانە (بروس هۆفمان) لە *کتێبەکەیدا* (*لە ناوەوەی تیرۆردا*) ساڵی ١٩٩٨ بە درێژی پێناسەی تیرۆری کردووە و دوایین پێناسەکەشی **"گۆڕانکاری سیاسی"** دەگرێتە خۆ ئەمەش وەك خواستێکی چالاکییەکانی تیرۆر لە کۆتاییهێنان بە دەوڵەت.[١٢]

ئەمەیان تاڕادەیەکی باش هاوکۆکە لەگەڵ ئەو بیرۆکە تەقلیدییەی کە دەڵێ تیرۆر هۆکارێکە بۆ کۆتاییهێنانی بنیاتەکان. (ریچارد فولکێنراز) لە وتارەکەی کە بەر لە ٩/١١ بڵاوی کردەوە ئاماژەی بەوەداوە کە خواستی نانەوەی قوربانی بەکۆمەڵ لە تیرۆردا هێشتا ڕووداوێکی ناباوە.(١٣) توێژینەوەیەکی نوێ لەسەر تیرۆر، پێشبینی پەیوەندییەکی مێژوویی و مەعریفی دەکات کە فاشیزمی بزووتنەوە ئیسلامییە توندڕەوەکانی ئەمڕۆی تیرۆر و بزووتنەوە چەوسێنەرەوەکانی سەدەی بیستەم بەیەکەوە گرێ دەدا و، زیاتر لەوەش جەخت لەسەر بەردەوامی تیرۆر دەکاتەوە نەك گۆڕان.(١٤)

بە هەرحاڵ، نوێترین لێکۆڵینەوە لەو گۆشەنیگایەوە دەڕوانێ، کە تیرۆری حاڵی حازری ماوەیەکی هەستپێکراوی لەچاو ڕابردوو بەجێهێشتووە. بێگومان هۆکاری جۆراوجۆر ڕۆڵیان بینیوە لە گەشەسەندنی ئەم جۆرە نوێیەی تیرۆر. "پاوڵ ویلکینسۆن" بڕوای وایە کە دیاردەی نەبوونی جیاکاری لە نێوان تیرۆریستەکاندا زاڵبوونی خۆی سەلماندووە و، کۆمەڵێك هۆکاریشی بۆ ئەم گۆڕانە کتوپڕە دیاریکردووە:(١٥)

یەکەم: تێربوونی میدیاکان بە وێنە توندوتیژەکانی کاری تیرۆریستی کە لە ئاستی تێکدان و وێرانکردن تێپەڕیکردووە و بەردەوام سەرنجی سەردێڕەکان بۆ خۆی ڕادەکێشێت.

دووەم: تیرۆریستان درکیان بەوە کردووە کە ئامانجەکانی وەك هاوڵاتیانی مەدەنی کەمتر مەترسی بۆ ئەوان دەنێتەوە.

سێیەم: لە کۆتاییشدا، گۆڕانێك یان گوێزرانەوەیەك لە نێوان ئەو تیرۆریستانەی کە هەڵگری بۆچوونی سیاسیین و ئەوانەیش کە توندڕەون هاتۆتە ئاراوە.



لە کاتێکدا کە هۆکارە دەستنیشانکراوەکانی ویلکینسۆن بە وردی وەسفی پێشڤەچوونەکانی ستراتیژییەت و تاکتیکی تیرۆریستان دەکات، بەڵام گەلێ بواری بنەڕەتی دیکە هەن کە کاریان لەسەر بکرێت. هەرچەندە ئیمڕۆ جیهان بە گۆڕانکاری جۆراوجۆردا تێپەڕدەبێ لە گەلێك ئاستی جیاوازدا، بەڵام ئەستەمە بتوانرێ هەموو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان بە تیرۆری ئەمڕۆوە بلکێنرێ، دەکرێ کۆمەڵێك هۆکاری ڕوون بەدواداچوونی بۆ بکرێ کە گردبوونەتەوە سەر یەك بۆ هێنانەکایەوەی چەشنێکی دیکەی تیرۆر کە پێشتر هاوشێوەی نەبووە لە سەر ئاستی ئەو هەڕەشەیەی کە لەسەرانسەری جیهاندا بڵاوی دەکاتەوە. ئەم وتارە هەوڵ دەدات بۆ دەرخستنی ئەو هۆکارانە لە ڕوانگەی کەلتووری و سیاسی و تەکنۆلۆجییەوە.

## هۆکاری کولتووری

توندڕەوە ئیسلامییەکان، ناوزڕاوترین شێوەی تیرۆری کەلتووری پێکدەهێنن، بەڵام دوور لە تاکە جۆری خواستی کولتووری کە هانی چالاکییە تیرۆریستییەکان دەدات. هەروەها گەلێ مەزهەبی ئایینی کە سەرهەڵدانیان لە گەلێ باردا لەگەڵ ئاوابوونی هەزارەی نوێدا هاوکۆك بوو، مەترسی بێ ئەندازەیان سەپاندبوو. بەڵام لە دواییدا، مافی ئایینی ئەمەریکی کەوتەکار لەگەڵ بڕەودان بە ئامانجە تێکدەرەکانیان، هەرچەندە بوونی هێزی سەپاندنی یاسا ئەم گروپانەی سنووردار کردبوو.

گرنگە کە تیرۆریستە ئایینییەکان و ئەوانەش کە ناوەرۆکییان ئایینییە، بەڵام ئامانجە سەرەتاییەکانیان سیاسییە لێك جیابکرێنەوە. گروپە تیرۆریستە هاندراوەکان بە ئایین، لە ١٩٨٠ تا ١٩٩٢ شەش بە قەد خۆیان گەشەیان کردووە و، لە نۆهەتەکانیشدا بەردەوامبوون لە گەشەکردن. (بروس هۆفمان) جەخت لەسەر

ئەوە دەکاتەوە: کە "گرنگترین خەسڵەتی کردە تیرۆریستییەکانی ئەمڕۆ بریتییە لە پابەندبوونی ئایینی".[١٦] ئەمە وا ناگەیەنێ کە ئەمە دیاردەیەکی تەواو نوێیە، بەڵکو یەکەم شێوەکانی هاندانی تیرۆر لەو ڕێگەیەوە بووە، بە چەشنێك تا پەیدابوونی هاندەری سیاسیی بۆ تیرۆر وەك ناسیۆنالیزم و ئەنارشیزم (ئاژاوەگێڕی) و مارکسیزم، ئایین تاکە بیانووی پەسەندکراوی تیرۆری دابین کردبوو. هەر چۆنێك بێت تیرۆر لە سەردەمی نوێدا تا ئەم چەند ساڵەی دوایی نەبێ بەم شێوەیە ئایینساڵاری پێوە پەیوەست نەببوو، بۆ نموونە، لەو کاتەی کە تیرۆری نوێی نێودەوڵەتی بۆ یەکەمجار سەری هەڵدا، لە نێو ١١ گروپی دیاریکراودا، هیچ یەکێکیان نەخرانە ڕیزی تیرۆری ئایینەییەوە.[١٨]

زۆربەی تیرۆریستانی ئەمڕۆ، چالاکییەکانی مردن و تێکدان وەك کارێکی پیرۆز یان سنوور بەزاندوو لە سەر ئاستی ڕوحی و باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی دەبینن. واقیعییەتی خۆپارێزی تیرۆریستە عیلمانییەکان کۆسپ ناخاتە بەردەم تیرۆریستانی ئایینی.[١٩] بەهەرحاڵ تیرۆریستی عیلمانی بۆی هەیە توندوتیژی لە جیاوازیکردن وەك کارێکی نا ڕەوشتی ببینێ، بەڵام بەلای تیرۆریستە ئایینییەکانەوە توندوتیژی جیاوازیکردن بۆی هەیە نەك هەر بیانوویەکی ڕەوشتی بێت، بەڵکو پێشکەوتنێکی پێویست و پەسەندکراو لە کێشە ئایینییەکەیان پێکدەهێنێت. سەرەڕای ئەوەش، ئامانجەکانی تیرۆریستە عیلمانییەکان زیاتر لەلای ڕای گشتی پەسەندکراون، چونکە توندوتیژی بێ مانا پشتیوانی لە کێشەکەیان کەم دەکاتەوە، هەروەها خراپتر بەسەریاندا دەشکێتەوە. وەك هۆفمان تێبینی کردووە، تەنانەت خودی جەماوەری تیرۆریستی عیلمانی و ئایینی جیاوازن، تیرۆریستی عیلمانی بەدوای ئەوەدا دەگەڕێ کە بەرگری لە خەڵکێکی بێ بەشکراو بکا یان دۆزەکەی بەرەو پێش بەرێ



و، داوای هاوتایی دەکات لە نێو ڕیزەکاندا، بەڵام تیرۆریستی ئایینی زۆر بەکەمی پشتیوان یاخود جەماوەریان بۆ کردارە تێکدەرەکانیان هەیە.[٢٠]

(ئۆم شیرینکیۆ) لە ڕیزی تیرۆری (تایپۆلۆجی)یەوەکانەوە دانراوە، کە ئیسلامییە توندڕەوەکانیش دەگرێتەوە، مەبەست لە تایپۆلۆجی ئەو ڕێکخراوانەن کە ئایین هاندەریانە لە هێرشکردنە سەر هێماکانی وڵاتە هاوچەرخەکان.[٢١] لە زۆر ڕێگەوە، گۆڕانی بەردەوامی گروپە ئایینییەکان، گروپی وەك (ئۆم شیرینکیۆ) بەرهەم دێنێت کە زۆر ترسناکترن لەو گروپە تیرۆریستییانەی کە لەسەر بنەمای نەریتییە ئایینییە کۆن و فراوانەکان ڕیشەیان گرتووە. ئەم گروپە ڕادیکاڵییانە هیچ پشتیوانێکی میانڕەو شك نابەن کە لە بیر و بۆچوونەکانیاندا هاوبەشیان بێت و لەهەمانکاتیشدا ئەوان کاری توندوتیژ و تێکدەرانە ئەنجام بدەن. ئاماژە بڕواپێکراوەکان لە هەریەکە لە ئاینی ئیسلام و مەسیحیدا دەتوانێ توندوتیژی تیرۆرستان بە ناڕەوا لە قەڵەم بدات و بیانووەکانیان پووچەڵ بکاتەوە، هەرهیچ نەبێ ئەگەر بە تێڕوانینێکی دڵسۆزانەوەش سەیریان بکات.

دیاردەیەکی دیکەی گروپە ئایینییەکان کە وایان لێ دەکات بە شێوەیەکی بڕوا پێنەکراو ترسناك بن ئەوەیە کە ئەم گروپانە سروشتێکیان لە بیرکردنەوەدا هەیە کە دڵسۆزی ئەندامانی گروپەکە بۆ سەرۆکێك ڕێگر دەبێ لەبەردەم شوێنکەوتووانی ئەم گروپە بۆ وەرگرتنی هەر بڕیارێکی خۆیان یان بگەڕێنەوە بۆ هەر سەرچاوەیەکی تری بیرکردنەوە. ئەگەر ئەم سەرۆکەش لەڕووی سۆزەوە یان هۆشەوە جێگیر نەبێت، ئەوا ئاکامەکەی وێرانکەر دەبێت. بۆیە گروپی تیرۆریستی ترسناکی نەریتە ئایینییەکان بۆی هەیە زۆرجاران لەم ڕاستییەدا هاوبەش بێت کە دەڵێ: سەرۆکی بەتوانا، کاریگەرییێکی بەهێزی بەسەر ئەندامانی گروپەکەوە هەیە.

بەگوێرەی زۆربەی لێکدانەوەکان، ڕێکخراوی (ئۆم شیرینکیۆ)ی یابانی توانا هەڕەشەییەکانی خۆی لە ڕێگەی هێرشی گازی (سارین) لە تونێلی تۆکیۆ ڕاگەیاند. هەروەك (D. W. Brackett) نووسی: "زەنگێکی تۆقێنەر لە تۆنێلی تۆکیۆ لێیدا". تیرۆریستان لە کردەوەکانیاندا بە دوای هەنگاوەکانی پابەندبوونەوە ناکەون، بەڵکو ئەو وانانە بە باشی هەڵدەمژن کە دەبێ لە کردەیەکی سەرکەوتووی توندوتیژیدا پیادەی بکەن. بێ گومان ڕێکخراوی ئۆم شیرینکیۆ، وەك یەکێك لە ترسناکترین کارا تیرۆریستییەکان تەنها ناوزڕاوی بۆ مایەوە. سەرەڕای نوشوستیش، وەك بەندکردنی کەسایەتییە سەرکردەییە گەورەکان، گروپەکە بەردەوام دەبێ بۆ سەپاندنی هەڕەشە لە داهاتوودا. توانای ئۆم شیرینکیۆ بۆ بەئەندامکردنی تاکی نوێ بە ئاستی باڵای ڕۆشنبیری و زانیاری تەکنەلۆژی، ڕواڵەتێکی بەرچاوی هەڕەشەی نیشاندا کە بەهۆی گروپی ئایینییەوە سەپێنرابوو.[٢٣]

لە ڕابردوودا، گروپە ئایینییەکان وەك هەڕەشەیەکی ئاسایشی نەتەوەیی سەیر نەدەکران، بەڵکو بۆ ئەوە ترسناك بوون کە خەڵکێکی نەفام بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەوانەوە و تەسلیم بە ئیرادەیان بن. هەرچۆنێ بێ، سیمای ئەم دواییەی ویستی گروپە ئایینییەکان و توانستیان لە وەدەستهێنانی ئامانجە کاولکارییەکانیان، تێگەیشتنێکی باشی لەمەڕ ڕاستییەکانی ئەو گروپانەوە بەدەستەوەدا. بەهۆی ئەوەی کە گروپە ئاینییەکان بە شێوەیەکی سەرەکی لەسەر بنەمای توندوتیژی ناچارکردن دامەزراون، بۆیان هەیە ڕاهاتبن لەسەر ئەم زنجیرەی بیرە کە زۆر پێویستە لە شێوازەکانی کاری تیرۆریستاندا هەبێ. هەرچەندە گروپە ئایینییەکان زیاتر پراکتیزەی توندوتیژی هۆشیی پیادە دەکەن لەگەڵ دەستبەسەرداگرتنی دەروونی و هێرشی توند بۆ سەر تایبەتمەندێتی کەسێتی، بەڵام جار نا جاریش لە کاری جەستەییدا خراپەکانیان نیشاندەدەن. ترسناکترین جۆری ئەم گروپانە، ئەوانەیانن کە



بە بۆچوونی دوایی هاتنی جیهان سەرنجکێشکراون، وەك ڕادیکاڵەکانی نێو زۆربەی ئایینە زاڵەکان. ئەندامانی ئەم گروپە ئایینییانە بە زۆری بڕوایان وایە کە ئەوان ئامراز و هۆکاری ڕوودانن. سروشتی کەسایەتییە ئەفسانەییەکانی گروپە ئایینییەکان دەکرێ ڕێنیشاندەر بێ لەمەڕ ئاستی مەترسییەکانیان.[٢٤] بە کورتی گروپە ئایینییەکان، بە وردی، شێوەیەکی ترسناکی تیرۆری ئایینین، چونکە دەتوانن بە خێرایی دەربکەون بە بێ هۆشدارکردنەوە و، ئامانجی عەقڵانییان نییە و، دەتوانن ببن بە هۆکاری دروستکردنی دڵەڕاوکێ و نائارامی لە ڕێگەی ترساندن و دوژمنایەتیکردن کە بە شێوەیەکی گشتی لە لای کۆمەڵگەوە وادەبینرێن.

ئەو توندوتیژییەی کە بەهۆی تیرۆریستی ئایینییەوە پیادەدەکرێ (چ گروپە ئایینییەکان یان توندڕەوە ئایینییەکان) زۆر مەترسیدارترە بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی کە لە ڕێگەی تیرۆری سیاسییەوە لە ساڵەکانی زووتردا هاتووەتە کایەوە. هەروەك هۆفمان تێبینیی کردووە، "بەلای تیرۆریستانی ئایینییەوە، توندوتیژی پابەندبوونێکی خواوەندییە... وەك وەڵامێکی ڕاستەوخۆ بۆ هەندێ فەرمانی خواوەند جێ بەجێ دەکرێت هەروەك لە کتێبی پیرۆزدا ڕێگەی پێدراوە".[٢٥] ئایین نەك هەر بۆی هەیە هێزێکی پاساوهێنانەوە بێ لە ڕێگەدان بە ئەنجامدانی ئەم کارانە، بەڵکو بە بوارێکی فراوان تیرۆریستان بۆ ئەنجامدانی کاری توندوتیژی لەدژی بەرانبەرەکانیان ناچاردەکات.[٢٦] توندوتیژی تیرۆریستان دەکرێ وەك ئامانجێکی ئیلهامبەخش لە خودی خۆیدا ببینرێ. لێکدانەوەیەك کە بۆ شیکردنەوەی توندوتیژی توندڕەویی ئیسلامی پێشکەشکراوە، تیایدا تۆڵە سەندنەوە وەك ئامانجێکی سەرەکی تیرۆریستان دەبینێ.[٢٧] ئەم بیرکردنەوەیە وادەکات لەگەڵ گۆڕانی سیاسی یان ئامانجە سیاسییە کۆنەکان هاوکۆك نەبێ، و بە تەریبی ئەو بۆچوونە هەنگاو بنێ کە وادەبینێ توندوتیژی لە خودی خۆیدا ئامانجیشە نەك تەنها

هەر هۆکار. ئیسلامییە توندڕەوەکان ناتوانن درك بەوە بکەن کە یان لەگەڵ باری سیاسیدا بژین یان سازشی لەسەر بکەن. داواکارانی تیرۆی پیرۆز وای دەبینن ئیسلام یان دەبێ زاڵ بێ یان دەبێ ژێردەستەبێ.[٢٨] لێکۆڵینەوەیەکی نوێ کە بەدواداچوونی بۆ ڕێچکەی خواوەند لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گرتە ئەستۆ، تێبینی ئەوەی کرد: ئەو پێشکەوتنە فەلسەفییانەی کە زۆربوونی خواستی نانەوەی قوربانی بەکۆمەڵ بە تیرۆری ئایینییەوە گرێدەدا لەلایەن پشتیوانانی ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە.[٢٩]

ئەو توێژینەوە نوێیەی لەسەر فەتواکەی ئوسامە بن لادن بڵاوکرایەوە لە گۆڤاری (*لێکۆڵینەوەکانی ململانێ و تیرۆر*) وایدەبینێ کە ناوەرۆکی فەتواکە نە شۆڕشگێڕانەیە نە شتێکی بێ هاوتاشە وەك ئەوەی هەڵوێستێکی گرنگی لە جیهانی ئیسلامیدا تێدا دەربڕیبێ، بە تایبەتی ئەو بەشەی کە ڕایگەیاند ئیسلام لەدژی بێگانە عیلمانییەکان و بە مۆدێرنبوون دەجەنگێ.[٣٠] هەرچۆنێ بێ هەندێ لە ناوەرۆکی فەتواکە ڕاستەخۆ چووە نێو ئەرازووی تیرۆری ئایینی هەنووکەیی. ئەمە چەند بەشێکییەتی:

"سوپاس بۆ خوا، کە کتێبی ئاشکراکرد و، دەستی بەسەر هەورەکاندا دەڕوات و، هەموو پارتەکانی تێکشکاند و، لە کتێبەکەیدا دەڵێ: کاتێك کە مانگە قەدەغەکراوەکان تێپەڕین، ئەوکاتە لە هەرکوێیەکدا موشریکەکانتان بینی لەگەڵیان بجەنگێن و بیانکوژن.

لەسەر ئەم بنەمایە و بە پێی پابەندبوون بە فەرمانەکانی خودا، ئێمە ئەو فەتوایانە بۆ هەموو موسوڵمانان دەردەکەین:



فەرمانی کوشتنی ئەمەریکییەکان و هاوپەیمانەکانی ـ مەدەنی و سەربازی، ئەرکی هەر تاکێکی موسڵمانە کە لە توانایدا بێ بە ئەنجامی بگەیەنێ لە هەر وڵاتێکدا کە بۆی بکرێ."[٣١]

لە وتارێکدا کە کەمێك دوای ڕووداوی ١١ی سێپتێمبەر بڵاوکرایەوە، (ستیڤن سیمسۆن و دێیڤید بنیامین) تێبینی ئەوەیان کرد کە گەلێ لە هێرشەکانی ئەلقاعیدە بە هێرشەکەی ١١ی سێپتێمبەریشەوە لە کاتێکی زۆر گونجاو و باش لە بەرژەوەندی فەلەستینییەکان لە پرۆسەی ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕوودەدات، بەڵام نەگۆڕانی هیچ هەڵوێستێك لە سیاسەتی دەرەوەی حکوومەتی ئەمەریکا بۆی هەیە ڕادیکاڵییەتی ئوسامە بن لادنی لەسەر ئەم کارەی سارد کردبێتەوە.[٣٢] لە کاتێکدا کە تیرۆریستە توندڕەوەکانی ئیسلامی ناوزڕاوترین توندڕەوی پیادەکردنی توندوتیژی ڕۆژگاری ئەمڕۆن، هەروەها هەندێکی دیکە وەك باڵی ڕاستی توندڕەوە مەسیحییەکان گەلێ خەسڵەت و جیاکەرەوەی تیرۆری نوێ نیشان دەدەن. (مارك جێرجینسمیر) لە پەرتووکەکەیدا (*لە بیری خوداوەندەوە، بەرزبوونەوەی توندوتیژی ئایینی*)، سێ ئاکاری دیاریکردووە کە ئیسلامییە توندڕەوەو و مەسیحی ڕادیکاڵی وتیرۆریستە ئایینییەکانی دیکە لێی هاوبەشن: یەکەمیان، ئەوانە بە شێوەیەك لە ئامانجەکانیان دەڕوانن یان تێیگەیشتوون کە پارێزگاری لە بوون و سەربڵندی و شکۆمەندییان دەکات. دووەم، لەدەستدان یان دۆڕاندنی ململانێکەیان کارێکی مەحاڵە. سێیەمیش، ململانێ و تێکۆشانەکەیان لە ژێرکەوتندایە یان ناتوانێت سەربکەوێ لە کاتی ڕاستەقینەدا یاخود بەزاراوەیەکی ڕاستەقینە.[٣٣]

لە ڕابردوودا تیرۆریستەکانی باڵی ڕاستی مەسیحی هاندراو بەهۆی ڕەگەز یان ئایینەوە، بە شێوەیەکی هەڕەمەکی لە دژی قوربانییە هەڵبژێردراوەکانیان چالاکی توندوتیژییان ئەنجامدەدا و، ڕووبەڕووبوونەوەش لەگەڵ حکوومەتدا سنووردار بوو تا

چەند قۆناغێك کە حکوومەت ڕووبەڕووی بەرنامەی سیاسی و ئایینی گروپە تیرۆریستییەکان بووەوە.(٣٤) بەڵام ئیمرۆ هەندێك لەو گروپانە دوژمنی ڕاستەوخۆی حکوومەتی ئەمەریکان، کە پشتیوانەکانیان بڕوایان وایە پیلانگێڕییەکی بەرفراوان لە ئارادایە و مەترسی لەسەر بوونی (شێوازی ژیانی مەسیحییە سپییەکان) هەیە.(٣٥) نوێترین ستراتیژییەتی هەڵسەنگاندنی (FBI) بۆ تواناکانی تیرۆری نێوخۆیی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا تیشکۆی خستووەتە سەر ئەو گروپانەی وەك (کیانی مەسیحی و، بزووتنەوە خۆپارێزە لەڕادەبەدەرەکان کە بە مەسیحییە ئوسولییەکانەوە پەیوەندییان هەیە). توندڕەوترینی ئەمانە، ئەوانەن کە پێگەی (نا مرۆڤ) یان (مرۆڤی پلەدوو) لەسەر بنەمای ڕەنگ بۆ خەڵك دیاری دەکەن، سەرەڕای ئەوەش بە کۆیلەیان دادەنێن و وایان دەبینن کە لە جەنگێکی بێ کۆتایی لەگەڵ هێزی شەڕ دان (هەر وەك لە ڕاگەیاندراوی ڕەگەزە نا سپییەکان و حکوومەتی بەهێز و شەڕخوازدا هاتووە). ئەم مەسیحییانە بە ئەرکی خۆیان دەزانن کە پەلە بکەن لە درککردن بە پلانەکانی خواوەند، کە ڕێگەیان دەدا و هانیشیان دەدا بۆ ئەنجامدانی توندوتیژی لە ئاستی باڵاتر.

بەڵام بۆ ماوەی چەند دەیەیەك توندوتیژی ئەو مەسیحییانە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بە بێ جیاوازی لە دژی کەمینە ڕەگەزییەکان و ئامانجی نا مرۆڤانە بە ڕێوەدەبرا، تا لە دواییەکانیدا بە ڕادەی ئەوە فراوانبوو کە هەوڵی تەقاندنەوە و ژەهراوی کردنی سەرچاوەکانی دابینکردنی ئاویان دا.(٣٦) ئەم هێرشە هەڕەمەکییانە ویست و ئارەزووی ئەم گروپانە لە هەوڵدان و کۆششکردن بۆ گەیاندنی زیان بە ئاستێکی بەرزتر و هێنانە ئارای قوربانی بە کۆمەڵ دەردەخا. تەقاندنەوەی باڵەخانەی فیدراڵی لە شاری ئۆکلاهۆما نموونەیەکی بەرچاوی ئەم خواستانەیە، هەرچەندە هەندێك بڕوایان وایە کە لێپرسراوێتی هێرشەکە دەکەوێتە



ئەستۆی هەندێ میلیشیای خۆپارێزی دیکە یان تیرۆریستی مەسیحی دیکە.(٣٧) یاسای سەپاندنی نێوخۆیی کاریگەر لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا بە ڕادەیەکی زۆر ئەم گروپانەی قەدەغەکرد لە ئەنجامدانی توندوتیژی بەرفراوان لە ئاستی ئەوەی شاری ئۆکلاهۆما، بە شێوەیەك وایکردووە کە ئەم ڕووداوە بارێکی هەڵاوێژراوی تراژیدی بێت لە ژمارەیەکی یەکجار گەورەتر لە پلانی سەرنەکەوتووی دیکە.

لە کاتێکدا کە بە دڵنیاییەوە هیچ هاوکاری و پەیوەندییەك لە نێوان ئیسلامییە بێگانەکان و مەسیحییە توندڕەوەکانی وڵاتە یەکگرتووەکاندا نییە، بەڵام وێکچوونێکی نیگەرانکەر لە دیدەکانیاندا بە دیدەکرێ. (ئۆگەست کریس) کە سەربە گروپێکی نیمچە سەربازیی (پۆسی کۆمیتاتەس) بەم شێوەیە و بە دەنگێکی شێواو وەڵامی ڕووخانی بنکەی بازرگانی نێودەوڵەتی دایەوە: (**هالالۆیا یاوێە = سوپاس بۆ خوا (یاوێە)، لەوانەیە شەڕ دەستی پێکردبێ، مردن بۆ دوژمنەکانی ئەو! بۆی هەیە بنکەی بازرگانی جیهانی بکەوێتە خوارەوە!**).(٣٨) پەرتووکە نوێیەکەی (جێسیکا ستێرن) بە ناوی (*تیرۆر بە ناوی خودا: بۆچی میلیشیای ئاینی کوشتار دەکەن*) کە تیایدا چاوپێکەوتنی لەگەڵ تیرۆریستە نێودەوڵەتییەکاندا بۆ ماوەی پێنج ساڵ کۆکردووەتەوە، وەنەبێ بە نموونەیەك لە گوانتانامۆ یان شەقامەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەستپێبکات،(٣٩) بەڵکو لە پێشەکییەکەیدا تیرۆریستە مەسیحییەکانی پێشوو لە پارکی ترێڵەکان لە ویلایەتی تەکساس بە نموونە دەهێنێتەوە، ئەمە لە کاتێکدایە کە تیرۆری ئیسلامییەکان دیارترین هەڕەشەن بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان، بەڵام تاکە مەترسیش نییە کە بەهۆی خواستی نوێی کەلتووری توندڕەو و توندوتیژی ئایینییەوە سەپێنراوە.

کەڵەکەبوونی کۆمەڵێك دیاردەی کەلتووری لە نێو گروپی تیرۆریستی جیهانیدا ئاستێکی بەرزی هەڕەشە دیاری دەکات، ئەم سیما و خەسڵەتانەش ئەمانە

دەگرێتەوە: بۆچوونی کوشتن بە مەبەستی چاککردن، پێویستیی ڕووخاندنی تەواوی کۆمەڵگە وەك بەشێك لە پرۆسەی پاڵاوتن، سەرقاڵ بوون بە چەکی بەکۆمەڵکوژ و، لە نێو گروپدا سەرکردەی باڵادەست بەشێوەیەك کەسایەتی خۆی بسەپێنێ کە شوێنکەوتووانی وێنەیەکی وەك ئەویان لێ بێتە بەرهەم.[٤٠] ئەم تایبەتمەندێتییانە بەیەکەوە دابڕانێکی بەرچاو دەنوێنن بە بەراورد لەگەڵ کەلتووری گروپە تیرۆریستییەکانی پێشووتر. ئەو ڕێکخراوانەی کە بەم خاسیەتانە جیادەکرێنەوە هەڕەشەیەکی توندیان بۆ جیهانی شارستانی لە هەگبەدایە.

### هۆکارە سیاسی و ڕێکخراوەییەکان

ئەو بارە گونجاوەی کە بۆ تیرۆری ئیمرۆ خولقاوە، بەهۆی گەلێ پیشکەوتنەوە بووە لەسەر ئاستی ڕووداوە جیهانییەکاندا. جیاوازی گەورە لە سەرچاوە و پێوانە ئابوورییەکان بۆ ژیان لە نێوان بەشە جیاکانی ئەم جیهانە، هۆکاری میللین و دەبنە مایەی پێدانی خوێنگەرمی و دڕاندایەتی تیرۆریستان،[٤١] ئەو لێکدانەوەیەی کە دەڵێ هەرەسی حکومی لە وڵاتە ڕووخاوەکاندا زەمینەیەکی بە پیتی بۆ پەروەردەکردنی تیرۆریستانی ئێستا خولقاندووە، بۆچوونێکە لە بارەی ئەم لۆجیکەوە ناکۆکی لەسەرە.[٤٢] بە هەر حاڵ تا ئێستا نە لێکدانەوەیەکی شمولی هەیە کە چۆن هەژاری تیرۆر دەخولقێنێ، نە ڕاگەیاندراوێکیش لە نێوان هەردووکیاندا بەدی دەکرێت.[٤٣] بەڵام هاتنی بەهاو دەزگا ڕۆژئاواییەکان بۆ ناو جیهانی ئیسلامی لە ڕێگەی پرۆسەی جیهانگەرایی بازاڕی ئازادەوە، لێکدانەوەیەکی ترە بۆ چۆنیەتی نەشونماکردنی تیرۆر، لەم بارەدا پارت و لایەنە بێهێزەکان تەنها تۆڵەسەندنەوەیان بۆ دەمێنێتەوە کە هەڵیبژێرن.[٤٤] جیهانگەرایی کە بریتیە لە کەمکردنەوەی سنووری تەکنەلۆژی، سیاسی، ئابووری و، کەلتووری



نێوان وڵاتان لە سەرانسەری جیهاندا، کەچی ئەم بارە لە کەلتووری کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییەکاندا بەرژەوەندی خۆیی و، گەندەڵی و خراپەکاری بازاڕی لێ کەوتووەتەوە. لە هەمانکاتدا جیهانگەرایی تیرۆری وروژاندووە و ڕێگاکانی ئەنجامدانیشی ئاسانتر کردووە.

یەکێك لە گەورەترین ئاکامەکانی جیهانگەرایی بریتی بووە لە بەرەو خراپ چوونی دەسەڵاتی دەوڵەت و، فراوانبوونی چەندجارەی (توانی) ڕێکخراوە نا حکومییەکان. هەروەها هاوپەیمانی هەرێمایەتی و، ڕێکخراوە جیهانییەکانیش ئەم خواستەی قایمتر کردووە. هەرچەندە بە دڵنیاییەوە مەبەست لە ڕێکخراوە نا حکومییەکان، ڕێکخراوە جیهانی و مرۆڤایەتییە کۆنەکان نییە وەك ڕێکخراوی خاچی سوور یان ڕێکخراوی پزیشکانی بێ سنوور. ئەلقاعیدە لەنێو سەرکەوتووترین ڕێکخراوە ناحکومییەکاندا خۆی جودا کردووەتەوە بە بەردەوامبوون و بەدواکەوتنی بەرنامە جیهانییە تایبەتییەکەی لە دابینکردنی دراو. خواستی دوورکەوتنەوەی تیرۆریستان لە بوونی پەیوەندی ڕاستەوخۆ بە وڵاتانی پاڵپشتیکەری تیرۆر، چەندین قازانج و سوودی هەبووە لە بوێرانە ئەنجامدانی توندوتیژی. بۆی هەیە گروپە تیرۆریستییەکان زیاتر هەوڵی وەدەستهێنانی پاڵپشتی جەماوەری نادیار بدەن، بۆیە ڕێگا و شێوازە توندوتیژەکان زیاتر پەسەندکراو دەبن، چونکە بەهۆی ئەم ڕێگایانەوە دەتوانرێ بە بێ دڵەڕاوکێ و ترس لە دوورخستنەوەی پاڵپشتی سیاسی پیادە بکرێن.[٤٦] (هارڤێی کوشنێر) ئەم پێشکەوتنەی بە گەشەی گروپی هەوادار وەسف کردو، کاتێك هاتە کایەوە کە یارمەتی وڵاتانی پشتیوان کەمتر بووەوە.[٤٧] (لۆورێنز فرێدمان) ئاماژە بەوەدەکات کە بەڕێوەبردنی ئەفغانستان لەلایەن تالیبانەوە تا ئەو ڕادەیە تیرۆری پاڵپشتیکراو لەلایەن دەوڵەتەوە نەبوو بەقەد ئەوەی تیرۆرێك بوو پاڵپشتی دەوڵەتی دەکرد.[٤٨]

بە هەرحاڵ، تیرۆرستان بەردەوام دەبن بۆ کەڵکوەرگرتن لە یارمەتی ناڕاستەوخۆی وڵاتانی پشتیوانی تیرۆر. هەرچەندە بواری ئەو وڵاتانە لە چاودێری و پاڵپشتی تیرۆر کەمبووەتەوە لە ئەنجامی جەنگی دژە تیرۆری حکوومەتی ئەمەریکا کە لە دوای ١١ ی سێپتێمبەرەوە دەستی پێکردووە، کەچی ئەم وڵاتانە بە بەربڵاوی لە شێوەی خۆیاندا دەمێننەوە. لە ڕاستیدا پەرەسەندن لە ئەنجامدانی کردە دژە تیرۆرییەکان بۆی هەیە هەندی خواستی ترسناك لە تیرۆری هاوچەرخدا بێنێتەکایەوە. کاتێك کە تیرۆریستان ناتوانن ڕاستەخۆ پاڵپشتی لە وڵاتانەوە وەربگرن، کەمتر دەتوانرێ دەستنیشان بکرێن و بەدواکەوتنیان سەختتر دەبێ. دەبێ وڵاتان خۆیان لە تێوەگلانی ئاشکرای تیرۆریستان بەدوور بگرن بە کەمتر والاکردنی دەرگا بۆیان و دواتریش کەمتر ڕێکخراوە تیرۆریستییە توندڕەوەکان لەباوەشبگرن. گەلێك وڵات چوونە نێو ئەو لیستەی کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەناوی وڵاتانی چاودێریکەری تیرۆر بۆ ماوەی زیاتر لە دەیەیەك بڵاوی کردەوە، لەوانەش: کوبا، ئێران، عیراق، کۆریای باکوور، لیبیاو سوریا، بەم دواییەش سودان و ئەفغانستان هاتنە نێو ئەم لیستە. هەندێ وڵاتی پشتیوان بۆ تیرۆریستان بەیەکەوە هاوکاری دەکەن بۆ پەرەپێدانی توندوتیژی تیرۆریستیو، بەشێوەیەك کاردەکەن کە چالاکییە تیرۆریستییەکان تەواو لەگەڵ سیاسەتی دەرەوەی هەر وڵاتێك لێکپچڕاو بێ. ئێران یارمەتی دارایی بە کەمپەکانی مەشقکردن لەسودان داوەو، جیهادی ئیسلامی فەلەستینیش پاڵپشتی لە هەردوو وڵاتی سوریا و ئێران پێگەیشتووە.[٤٩]

ئەوەی زیاتر تەنگژە دەخاتە کێشەکەوە، ڕێگاکانی بەخشینی یارمەتی داراییە، کە زۆرجاران هیچ پێوانەیەك نییە بۆ لێپرسینەوە. پاڵپشتی ئێران بۆ ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان ناتوانێ هیچ ئامانجێکی دیاریکراو بگرێتە خۆو، ئەنجامەکەشی هەندێ جار بە لەدەستچوونی بڕی یارمەتییەکە کۆتایی دێت بەهۆی ئەنجامنەدانی



هیچ کارێکی تیرۆریستی.[٥٠] ئەم پێچەوانەبوونەوەش لەسەر وڵاتە پاڵپشتیکەرەکان دەکەوێتەوە، بەهۆی جار نا جاری پێدانی پاداشت لە بری وێرانکردن و هەروەها تەمومژاوی بوونی ئەو بەڵگانەی کە تیرۆریستان بە وڵاتەکانەوە گرێ دەدەن، بۆیە ئێران بە ئەنقەست پێکهاتووێکی فەرماندەیی لامەرکەزی بۆ ئەم قازانجانە پێکهێناوە.[٥١] وڵاتانی پشتیوان بەرژەوەندی زیاتریان لە هێشتنەوەی دەستڕۆیشتوویی کردەوە توندوتیژەکان بریتییە لە پاراستنی خۆیی، بۆ نموونە، ڕێکخراوی هەواڵگەری حکوومەتی سودان بە ئاشکرا چاودێری ئوسامە بن لادنی دەکرد کاتێك کە لەو وڵاتە دەژیا. لە ڕواڵەتدا بۆ ئەوە بوو تا بەرهەڵستکارانی خۆی قەدەغە بکا لە ئەنجامدانی کاری توندوتیژی تەنانەت لەو وڵاتەشدا کە خۆی داهێنەری توندوتیژییە.[٥٢]

لە کاتێکدا کە کردەوەی سەربازی ئەمەریکا لە ئەفغانستان و عیراق لە مەترسی ئەو وڵاتانەی کەمتر کردەوە، هەندێ وڵاتی دیکەی پشتیوان بۆ تیرۆریستان بەهۆی هۆکاری سیاسییەوە ئەم لیستەیان بەڕەسمی جێهێشتووە. ( زۆرجار قسەوباس لەوە دەکرێ کە هەر وڵاتێك ناوی بچێتە لیستی وڵاتانی پشتوان بۆ تیرۆریستان، ئەوا ڕەنگدانەوەی لەسەر پەیوەندی نێوان ئەو وڵاتە و وڵاتە یەکگرتووەکان دەبێت)[٥٣] بە گوێرەی ڕاپۆرتەکان هەواڵگەری پاکستانی لە یارمەتیدانی توندوتیژی تیرۆریستی لەهەردوو دۆزی ئەفغانستان و هەرێمی پڕ ململانێی کشمیر تێوەگلابوو. جگە لەمەش، میرنشینی عەرەبی سعودی لە چەقی مشتومڕەکاندا بوو کە وڵاتێکە چاودێری توندوتیژی دەکات و تیرۆریستان بەرهەم دەهێنێ. (لۆورێنت میوراویك)، شرۆڤەکارێکی دەزگای (ڕاند ـ RAND) ە، لە ساڵی ٢٠٠٢ لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی سیاسەتی بەرگری، سەرنجی گشتی بەوە بۆ لای خۆی کێشکرد کە ئاماژەی بە مەترسی سعودیای عەرەبی کرد لە

پشتگیریکردنی توندڕەوە ئیسلامییەکان بە شێوەیەکی دیاریکراویش ئوسامە بن لادن. لە کاتێکدا هیچ بڵاوکراوەیەکی ئەم دەزگایە پێشبینی بۆچوونێکی لەم جۆرەی نەوروژاندبوو، زیاتر لەوەش، (میوراویك) تیشکی خستە سەر چەند بەڵگەیەك لە یارمەتی دارایی سعودیا بۆ بەرنامە ئیسلامییەکان لە ڕێگەی ناوچەکانی پەروەردەکردنی ئیسلامی و بەخشینی یارمەتی پێیان.

بۆیە کە جیهانگەرایی یارمەتی لادانی گەلێ سنووری دا کە پێشتر وڵاتە پشتوانەکان سەپاندبوویان، تیرۆریستان دەتوانن بە ئاسانی مامەڵە بە پارەکانیان بکەن و پارێزگاریشی لێبکەن کە دەوڵەتە پشتیوانەکان بۆیان دابین دەکەن. هۆکارێکی دیکەی جیهانگەرایی کە تیرۆریستان سوودیان لێوەرگرتووە بریتییە لە پێکانی ئامانجەکانیان: "لە دونیای جیهانگەری ئەمڕۆدا، تیرۆریستان دەتوانن بە شێوەیەکی ئاسانتر بگەنە ئامانجەکانیان کە لە زۆربەی شوێنەکاندا بەدیدەکرێن و، ئەو هەواڵ و بیرۆکانەی خەڵك دەوروژێنن بۆ پەنابردنە بەر تیرۆر بەشێوەیەکی فراوانتر و خێراتر بڵاودەبێتەوە وەك لە ڕابردوو."[٥٤] لەنێو ئەو هۆکارانەی کە لەم پرۆسەیەدا هاوبەشن، ئاسانکاری هاتووچۆیە بە نێو سنوورەکاندا و، پێشکەوتنی ژێرخانی خولاوەی جیهانییە، کە یارمەتیدەرە بۆ بەئەندامکردن وبەرزکردنەوەی ئاستی دارایی و، گواستنەوەی کەلوپەلەکان و، هەندێ ئەرکی لۆجیستیکی دیکەیە.

سەرەڕای گۆڕانە سیاسییەکان لەسەر ئاستی جیهانیدا، پەرەسەندنی پراکتیزەکردنی ڕێکخراوەییش مەترسی تیرۆریستانی زیاتر کردووە، هەروەك ئەو هاوکارییەی لە نێوان ڕێکخراوە تیرۆریستییەکاندا هاتۆتە ئاراوە. گروپە تیرۆریستییەکان لە پێکهاتەی ڕێکخراوەیی ستوونی پلەدار، بۆ گروپی شێوە ئاسۆیی گەشەیان کردووە کە فەرماندان کەمتر تیایدا باوی هەیە. (جۆن ئەرکویلا،



دێیڤید ڕۆنفیچلت و، مایکل زانینی) تێبینی ئەوەیان کردووە "سەرکردایەتی تیرۆریستی لە کۆمەڵێك بنەماوە وەرگیراوە کە دەتوانێ سنوور دابنێ و هێڵی ڕێنماییەکانی بڕیاروەرگرتن و چالاکییەکان دابین بکا، بۆیە ئەندامەکان پێویست ناکا بگەڕێنەوە سەر شێوەی پلەدارێتی. ئەوان دەزانن کە دەبێ چی بکەن". نووسەرەکان بە شێوەیەك وەسفی نەخشە ڕێکخراوەییەکان دەکەن کە هەندێ جار بێ سەرن (سەرکردە) و هەندێ جاریش زیاتر لە چەند سەرێك (وەك هایدرا) بەخۆوە دەگرن.[٥٥] (پاول سمیت) تێبینی کردووە کە پێکهاتەی فرەخانەیی ئەلقاعیدە، چالاکی و ڕووپۆشی بە ڕێکخراوەکە دەبەخشێ و بووەتە مایەی هێزێکی گەورە بۆی.[٥٦] ئەم نەرم ونیانیە ڕێگەی بە قاعیدە داوە بۆ دامەزراندنی چەندین بنکە بە بەکارهێنانی کەسایەتی نێوخۆیی (میللی) لە سەرانسەری جیهاندا، هەروەها ڕێکخراوە ناحکومییە ئیسلامییەکانی خستووەتە نێو گروپەکەی بۆ ئەوەی کارەکانی تێدا بشارێتەوە.[٥٧] (جێسیکا ستێرن) بەم دواییە لێدوانێکی دا دەربارەی توانای ئەلقاعیدە لە هێشتنەوەی چالاکییەکانی بەشێوەی هێرشی بێ وێنە نووسی:

وەڵامەکە دەکەوێتە سەر سروشتی هەمیشەگۆڕاوی ڕیکخراوەکە. بەدرێژایی ماوەی ژیانی، ئەلقاعیدە بە چەسپاوی گەشەی کردووە و ئامادەیی سەرسوڕهێنەری خۆی لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی نیشانداوە. ئەم توانایەی گۆڕان وایکردووە کە بە چەسپاوی داوای بۆ بەئەندامکردن و ڕاکیشانی سەرنجی هاوپەیمانی نوێ زیاد بکا و، نیگەرانی و مەترسیشی لە بۆچوونی ڕۆژئاوا ، وایکردووە کە زیاتر هەوڵی پشکنین بداو سەختتر کاولکاری ئەنجام بدا.[٥٨]

## هۆكاره تەكنۆلۆژییەكان

سەرەڕای هاندەرە كەلتووری و ئایینییەكانی تیرۆریستان و، هۆكارە ڕێكخراوەیی و سیاسییەكان كە لە ئەنجامدانی كارەكانیان توانایان پێدەدات، تەكنۆلۆژیا لە گەلێ ڕێگەوە پێشكەوتووە بۆ دابینكردنی هەلومەرجی باشتر بۆ تیرۆریستان بە شێوەیەك كە بەر لەوە هاوتای نەبووە. هەرەسهێنانی یەكێتی سۆڤیەت و ئەگەری زۆربوونی چەكی ناوكی بۆ وڵاتە بەكارنەهێنەرەكانی ئەم چەكە، هۆكاری یەكەمە و بە شێوەیەكی بەرچاو بووەتە مایەی زیادبوونی هەڕەشەی تیرۆری ناوكی.[٥٩] هەرچۆنێك بێ، جگە لە چەكی بە كۆمەڵكوژ و زیانیاری تەكنۆلۆژی، چەكی دیكەش هەلومەرجیان بۆ تیرۆریستان خولقاندووە كە لە گەلێ ڕێگەوە مەترسی فراوانتر لە تیرۆری ڕادیۆلۆجی بێننە كایەوە، چونكە ئەم جێگرەوانە ئەگەری زیاتریان هەیە بۆ ئەنجامدانیان.

هەندێ لە توێژەرەوان پێیانوایە چەكی بە كۆمەڵكوژ ئەو چەكە نییە كە زۆربەی تیرۆریستان لە چالاكییەكانیان هەڵیدەبژێرن تەنانەت لەم جیهانە گۆڕاوەی ئێستاشدا. (ستێرن) دەنووسێت كە: "تیرۆریستان بەردەوام دەبن لەوەی كە لە چەكی بە كۆمەڵكوژ دووربكەونەوە بەهۆی گەلێ هۆكاری جۆراوجۆر و، بۆمب و چەكی سادە بە باشتر دەزانن".[٦٠] (براین جێنكینز) لەگەڵ ئەو بۆچوونە هاوكۆكە كە زۆربەی تیرۆریستان لە ڕووی تەكنۆلۆژییەوە خۆپارێزن، بەڵام تێبینی ئەوەشی كردووە: ئەو كۆت و بەندە ڕەوشتییانەی كە لەسەر خۆیان سەپاندوویانە و زۆرجار دەست بەسەر چالاكییە تیرۆریستییەكان دادەگرێت، بەرەو پووكانەوە دەچێ.[٦١] هەركە خواست و ئارەزووەكان دەگەنە كامڵ بوون، نیازی بەكارهێنانی چەكی بە كۆمەڵكوژ و مەیلی نانەوەی قوربانی بەكۆمەڵ لە تیرۆردا زیاتر دەبێت و بۆی هەیە



تیرۆریستان بگەڕێنەوە سەر ئەم چەكانە كە باشترە بۆ پێكانی ئامانجەكانیان و زیاتر لەگەڵ بنەماكانی ڕەوشتیان دەگونجێ.

(وۆڵتەر لاكوێر) لە (*تیرۆری نوێ*) دا جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە فەراهەمبوونی چەكی بەهێزی بەكۆمەڵكوژ وەك هەڕەشەیەكی هەنووكەیی گەورە ڕووبەڕووی جیهانی شارستانی دەبێتەوە.[٦٢] لە نێو جۆرەكانی چەكی بەكۆمەڵكوژدا، چەكی بایۆلۆژی و كیمیایی لەوانی دیكە مەترسی گەورەتر پێكدەهێنن. چەكی بایۆلۆژی دیاریكراوترن، چونكە پێویستی بە مامەڵە و بەركەوتنی ڕاستەوخۆی مرۆڤ دەبێت بۆ بڵاوكردنەوە و گەیاندنی كاریگەرییەكانی. بەڵام لەگەڵ ڕاگەیاندن و بڵاوكردنەوەی هەواڵێكی لەم شێوەیە، ترس و دڵەڕاوكێ و نائارامی، دەتوانێ بە بوارێكی فراوان زیانی ئابووری و سیاسی بنێتەوە، بەبێ ئاماژەكردن بەو ڕادەیەی ئازار كە مرۆڤ دەیچێژێ لەو كەسانەی كە بەر هۆكارە توشكەرەكە دەكەون. چەكی بایۆلۆژی دەتوانێ بەچەندین ڕێگە لێبدرێت: كە ڕێگەی ڤایرۆسی و بەكتیری و، بەكتریای نەخۆشی مشەخۆر (ریكیتسیا - بەكتریایەكە وەك ڤایرۆس دەتوانێ لەنێو خانەی خانەخوێدا بژیێ) دەگرێتەوە.

مادەی ژەهراوییە كیمیاییەكان جیاوازن لە چەكی بایۆلۆژی لەوەی كە ئەوانە هۆكاری نازیندوون و پێویستییان بە تووشبوون و بەریەككەوتنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ قوربانییەكاندا هەیە ئەمەش وادەكات كە بڵاوبوونەوەی كاریگەری چەكەكە بەردەوام نەبێت، بەڵام كاریگەری ڕاستەخۆی زیاترە و لەوانەشە زیانی زۆرتر بگەیەنێت. هۆكارە كیمیاییەكان لە چەند جۆرێكدا خۆیان دەنوێنن، وەك: هۆكارە خنكێنەرەكان كە شانەی سییەكان تێكدەدەن، هۆكارەكانی خوێن كە دەبنە مایەی پووكانەوەی ئەندامە چالاكەكان، هۆكارە سوتێنەرەكان (ڤاسیكانت) كە كاریگەری لەسەر پێست دەردەخەن و، زۆربەی هۆكارە كوژەرەكانی دەمار. گەلێ شێوازیش

هەن کە ڕێگە بەو هۆکارانە دەدەن قوربانییەکان بپێکن، لەوانەش: هەناسەدان، مژین لەڕێگەی پێستەوە و، خواردن و چوونیان بۆ ناو جۆگەی هەرس. وروژاندنی ئەم مەترسییانە خۆی ئەو ڕاستییە دەگەیەنێ کە گەلێك لەو هۆکارە کیمیاییە کوشندانە یان پێکهاتووەکانیان لە ئالوگۆڕی بازرگانیدا دەستدەکەون.

ڕاپۆرتی ساڵانەی (وەزارەتی دەوڵەت) لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ڕووداوەکانی ١١ ی سێپتێمبەری ٢٠٠١ بەڵگەی ئەوە دەدەنە دەست کە خواست و توانستی ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان بەرەو ئەوە ڕێچکە دەگرێ کە پلان دابڕێژن بۆ ئەنجامدانی هێرشی بەکۆمەڵکوژ. هەروەها ڕاپۆرتەکە ئەوەشی ڕاگەیاند کە ئەم هێرشانەی پێشتر هاوتایان نەبووە، ئەگەری ئەوەی لێ دەکرێ ببنە مایەی برەودان بە بواری تیرۆر لە ڕووی شێوازەکانی چەکی کیمیایی و بایۆلۆژی و ڕادیۆلۆژی و ناوکی.(٦٣) لەوەش زیاتر ڕاپۆرتەکە هەندێ بەڵگەی نیشاندا کە لە هێرشی سەربازی بۆ سەر ئەفغانستان لەنێو هۆکارە تیرۆریستییەکانی ئەوان دەستی بەسەردا گیرابوو. هەروەها بەکارهێنانی ژەهر لەلایەن بزووتنەوەی حەماس بۆ ڕووپۆشکردنی پارچە (ساچمە) لە تەقەمەنییەکاندا و، گرتنی گروپێکی بێ ناو لە ئیتالیا کە چەند نەخشەیەکی باڵیۆزخانەی ئەمەریکایان لەو وڵاتە لەبەردەستدا بووە و توانای تەواویشیان هەبووە لە بەرهەمهێنانیی گازی سیانیدی هایدرۆجینی کوشندە. هەروەها چالاکی گروپە ئایینییەکانی وەك (ئۆم شیرینکیۆ) و پلانەکانی تیرۆریستە ئەمەریکییەکان بۆ ژەهراویکردنی سەرچاوەی ئاوی شارەوانی، ئەمانە هەمووی بەڵگەی زیاتری مەترسی و هەڕەشەی چەکی بە کۆمەڵکوژ بەدەستەوە دەدەن.

پەرەسەندنێکی گەورەی دیکە بریتییە لە پێشکەوتنی نوێی پەیوەندیکردن و تەکنۆلۆژیای زانیاری. ئەم تەکنۆلۆژییە هەردوو هۆکاری یارمەتی و هەلومەرجی



ئەنجامدانی ئامانجەکانی بۆ تیرۆریستان دابینکردووە، بەوەی کە کۆمەڵگە زۆر شارستانییەکان تاڕادەیەکی بەرز پشتیان بە ژێرخانی زانیاری بەستووە. لەوەدەچێ تیرۆریستان لە لێکپچڕاندنی ئەنتەرنێت خۆیان بەدوور بگرن، چونکە ئەمان ئەو تەکنۆلۆژییەیان بۆ مەرامی خۆیان لە پەیوەندیکردن و بڵاوکردنەوەی پڕۆپاگەندەکانیان بەکاردەهێنن. بەم پێیە تیرۆریستان زیاتر پچڕاندن و تێکدانی سیستەمەکانیان لەلا مەبەست دەبێت زیاتر لەوەی کە بە یەکجاری تۆڕی زانیاری تێکوپێك بدەن.(٦٤) لە کاتێکدا کە ئەم چەشنە هێرشەی تیرۆریستان بۆ سەر سیستەمەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان یان ژێرخانی زانیاری جیهانی، کارەساتێکی گەورەی دارایی و کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە، بەڵام تیرۆریستان تا ئێستا خواست و توانستی ئەوەیان نیشان نەداوە بۆ هێرشی بەکۆمەڵ لەم بوارەدا و، چەند هێرشێکی دیاریکراو بە درێژایی ئەم هێڵە ئەنجامدراون بەڵام کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبووە. بەگشتی بەکارهێنانی فراوانی تەکنۆلۆژیای زانیاری یارمەتیدەرێکی باشی تیرۆریستان بووە لە بری ئەوەی ئامانجێك بێت لە چالاکییەکانیاندا. ڕاپۆرتێك لە بارەی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت و ئیمێڵ لەلایەن قاعیدەوە بۆ هەماهەنگیکردن لە لێدانی بنکەی بازرگانی جیهانی و پنتاگۆن، نموونەیەکی زەقی ئەم جۆرە هاوکاریکردنەیە. هەروەك (پاول پیلەر) تێبینی کرد "گەورەترین کاریگەری تەکنۆلۆژیای زانیاری لەسەر تیرۆریستان، بریتییە لە ڕێکخستنی کاری ڕۆژانە و پەیوەندیکردنیان، زیاتر لەوەی کە ڕێگەیەکیان بێ بۆ هێرشکردن".(٦٥)

هەروەها تەکنۆلۆژیا توانای تیرۆریستانی لە بەڕێوەبردنی هێرشی بەکۆمەڵکوژ زیاتر کردووە، وەك پێشتر تێبینیکرا، خراپترین هێرشی تیرۆریستی بەتەنیا بەر لە ٩/١١، ٣٨٠ کەسی کردە قوربانی. بەڵام بەرهەمی چەکی هەنووکەیی ڕادیۆلۆژی و کیمیای و بایۆلۆژی و ناوکی دەتوانێ ئەم ژمارەیە یەکجار بچووکتر بکاتەوە و

ئامانجە تیرۆریستییەکانی ئەمڕۆ بەدەستبهێنێت هەروەك نموونەی هێرشی سەر بنکەی بازرگانی و پنتاگۆن و، تەقاندنەوەی باڵەخانەی ئۆکلاهۆما و، گازی سارین لە تۆنێلی تۆکیۆ و،هێرشەکانی دیکەی ئەم دەیەی ڕابردوو. پێشکەوتنەکانی تەکنۆلۆژی و فەراهەمبوونیان و بڵاوبونەوەیان لەلایەن ئابووری بازاڕی جیهانگەرایی، بێ گومان مەترسی تیرۆریستی فراوانی دەبێ لەسەدەی نوێدا بەشێوەیەك کە نەتوانرێ لێی دووربکەوینەوە.

## ئەنجام

پراکتیزەکردنی تیرۆر لەم ساڵانەی دواییدا بە گۆڕانکاری بەرچاو تێپەڕیوە. توندڕەویی ڕەها کە ڕواڵەتی ڕێکخراوە تیرۆریستییەکانە لە ڕێگەی شەبەنگی سیستەمی بڕواکان بەشێکی گەورەی ئەم گۆڕانە لە ئامێزدەگرێ. لە ڕابردوودا، شیمانەی ئەوە دەکرا کە تیرۆریستان بکەونە ژێرەوە بەهۆی ڕەچاوکردنەکانی پراکتیکییانەی گۆڕانە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان، یان ڕای گشتی، یان هەندێ هۆکاری لەو بابەتە. ئیمڕۆ، دیاردەیەك کە دەگمەنبوونێکی وردە لە ڕابردوو، تیرۆریستان خواستەکانیان لە مردن و تێکدان خەستکردووەتەوە لە پێناوی خۆیاندا. سەرەڕای ئەمەش قەبەیی ئەمڕۆی تیرۆریستان سنوورە یەکلاکەرەوەکان لادەدا کە جاران توندڕەوترینی تیرۆریستانی دەپشکنی یان قەدەغەی دەکردن لە گەیشتن بە بەرزترین ئاست لە ڕێکخراوەکانیاندا. تیرۆریستان تا ئێستاش دەتوانن کار بە دراوەکان بکەن و پارێزگاریشی لێبکەن کە تەنها دارایی نەتەوەیی دەتونێ لایبدات، بەڵام بە تەنیا لە پلەیەکی گەورەتر و ژمارەیەکی زیاتر دان وەك لە ڕابردوو. لە ڕووی ڕێکخراوەییشەوە، تیرۆریستان سیستەم و پێکهاتنی پلەکانی دەسەڵات بەکارناهێنن کە لەم چەند ساڵەی دواییدا بەدیارکەوتووە. لە کۆیتاییدا، بوونی



توانای تەکنۆلۆژی چەکی بە کۆمەڵکوژی کیمیایی و بایۆلۆژی و ناوکی و ڕادیۆیی، بۆچوونێکمان پێ دەبەخشێ، ئەویش ئەوەیە، ئەم خواستانە دەکرێ کارەساتێك بقەومێنن کە پێشتر وێنەی نەبووە.

لە چاو ساڵانی پێشوو، تیرۆر لە هەردوو بواری چەندێتی و چۆنێتی گۆڕانی بەخۆیەوە بینیوە. تیرۆری ئێستا ماوەیەکی بەرچاوی جێهێشتووە تەنانەت وەك لە ماوەی شەڕی ساردیشدا. ستراتیژیەتی ئاسایشی نیشتمانی، تیرۆری لەشێوەی دەربڕینێکی لەیادنەچوو دەربڕیوە ( **کورتبڕی لە توندوتیژی و تەکنۆلۆژیادا**) کە وەك مەترسیی ئاسایشی لە دوای جەنگی ساردا وەسفی دەکات. کاریگەریی کاولکارییانەی ٩/١١ لەسەر وشیاری ستراتیژیەتی ئەمەریکا و ژینگەی ئاسایشی جیهانی زیادڕەوی تیادا نەکراوە، ئەم هێرشانە لە یەکگرتنی هۆکارە تەکنۆلۆژی و سیاسی و کەلتوورییەکاندا هاتە بەرهەم و ڕاگەیاندنێك بوو بۆ جیهان لە سەرهەڵدانی تیرۆری نوێ.

## پەراوێزەکان

١ـ وەزارەتی دەوڵەتی ئەمەریکا، *شێوازەکانی تیرۆری جیهانی*، ٢٠٠١ (واشینتۆن: GPO ئایاری ٢٠٠٢) و ل١٧١. پێداچوونەوە ئامارییەکانی ڕاپۆرتی وەزارەتی دەوڵەت هەموو قوربانییەکان ناگرێتەخۆ، تەنها ئەوانەی ئەمریکییەکانە و، ئەو قوربانییانەی کە لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە هاوڕێك لەگەڵ ژمارەی هێرشەکاندا نییە، ژمارەی قوربانییان لە ڕووداوە تیرۆریستییەکان بۆ پێنج ساڵی پێشووتر وەرگیراوە بەرانبەر بە ٢٠ ساڵی ڕابردوو.

٢ـ نادین گوڕ و بنیامین کۆل، *سیمای نوێی تیرۆر: مەترسی چەکی بەکۆمەڵ کوژ*، (نیویۆرك: I.B. تاوریس، ٢٠٠٢).

٣ـ دێیڤید ك. ڕاپۆپۆرت، شەپۆلی چوارەم: *١١ی سێپتێمبەر و مێژووی تیرۆر*، *"مێژووی ئێستا"* دیسێمبەری ٢٠٠١، ل٤١٩ ـ ٤٢٤.

٤ـ کۆمسیۆنی نیشتمانی تیرۆریزم، *بەرەنگاربوونەوەی مەترسی نێودەوڵەتی تیرۆر:* ڕاپۆرتی کۆمسیۆنی نێودەوڵەتی بۆ تیرۆر، (واشنتۆن GPO، ٢٠٠٠).

٥ـ وۆڵتەر لاکوێر، "*ڕووی نوێی تیرۆر*" گۆڤاری هارڤارد ئینتەرناشنال ریڤیو، ژمارە ٢٠(پایزی ١٩٩٨)، ل٤٨ـ٥١.

٦ـ ریچارد أ. فولکنراس و، رۆبێرت د. نیومان، وبرادلی أ. سایەر، *پاژنەی ئەخیلی ئەمریکی: تیرۆری ناوەکی، بایۆلۆجی، کیمایی و هێرشی نهێنی*، (کمبریج، چاپی ١٩٩٨): فیلیپ ب. هیمان، *تیرۆر و ئەمەریکا: ستراتیژیەتی کۆمۆنسێنس بۆ کۆمەڵگەیەکی دیموکراتی* (کمبریج، ١٩٩٨): بروس هۆفمان، *لەنێو تیرۆردا* (نیۆیۆرك: زانکۆی کۆلۆمبیا، ١٩٩٨): براد رۆبێرتس، *تیرۆریزم بە چەکی کیمیای و بایۆلۆژی: پێوانەکردنی مەترسی و کاردانەوەکان* (ئەسکەندریە ١٩٩٧): جێسیکا ستێرن، *دوایین تیرۆریستان* (کامبریج، زانکۆی هارڤارد، ١٩٩٩).

٧ـ ئاشتۆن کارتر و، جۆن داج و، فیلیپ زیلیکۆ، "*تیرۆری کاولکار*" گۆڤاری فۆرێن ئەففێیر، ژمارە ٧٧، نۆڤێمبەر ـ دیسێمبەر ١٩٩٨) ل٨٠ـ٩٤.

٨ـ س. ك. مالیك، *بۆچوونە قورئانییەکان لەمەڕ تیرۆر* (لاهور، هیندستان: وەجیدالیس، ١٩٧٩) لە یوسف بۆدانیسکی وەرگیراوە، بن لادن (ڕووسڤێلت، کالیفۆرنیا: بلاوکردنەوەی پریما ١٩٩٩) پێشەکی لXV.

٩ـ کۆمسیۆنی نێونەتەوەیی بۆ تیرۆر، *بەرەنگاربوونەوەی مەترسی گۆڕاو*، ل٢.

١٠ـ کریس کویلن، "*شیکردنەوەیەکی مێژوویی بۆمبی بەکۆمەل کوژ*"، گۆڤاری ستەدیس ئین کۆنفلیکت ئاند تیرۆریزم، ژمارە ٢٥، (سێپتێمبەر ـ ئۆکتۆبەری ٢٠٠٢)، ل٢٧٩ ـ ٢٩٢.

١١ـ وۆلتەر لاکوێر، *جەنگ کۆتایی نییە: تیرۆر لە سەدەی بیست و یەکەمدا* (نیویۆرك: زنجیرە، ٢٠٠٣).

١٢ـ بروس هۆفمان، لە نێو تیرۆردا (نیویۆرك: زانکۆی کۆلۆمبیا، ١٩٩٨).

١٣ـ ریچارد فۆلکنراس، "*بەرەنگاربوونەوەی تیرۆری ناوەکی، بایۆلۆژی و، کیمیایی*" گۆڤاری سیرڤایڤەل، ژمارە ٤٠ (پایزی ١٩٩٨)، ل٥٢.

١٤ـ پاول بیمان، *تیرۆر و لیبرالیزم* (نیویۆرك: W.W. Norton, 2003).

١٥ـ پاول ویلکینسۆن، *تاکتیك و ئامانجەکانی تیۆر: مەترسی نوێ بۆ سیستەمی جیهان*، گۆڤاری کۆنفلیکت ستەدی، ژمارە ٢٣٦ (واشنتۆن: دەزگای لێکۆڵینەوەی ململانێی و تیرۆریزم، دیسێمبەری ١٩٩٠)، ل٧.

١٦ـ هۆفمان، *لە نێو تیرۆردا*.

١٧ـ دێیڤید ك. ڕاپۆپۆرت، "*ترسو دڵەڕاوكێ: تیرۆر لە نەریتی سێ ئاییندا*"، گۆڤاری ئەمەریكان پۆلیتیكەل ساینس ڕیڤیو، ژمارە ٧٨ (سێپتێمبەر ١٩٨٤) ل٦٦٨ـ٦٧٢.

١٨ـ بروس هۆفمان، "*تیرۆری پیرۆز: ئەنجامدانی تیرۆری هاندراو بە پابەندبوونی ئایینییەوە*"، گۆڤاری كۆنفلیكت ستەدی، ژمارە ٧٨ (ئۆكتۆبەر ـ دیسێمبەر ١٩٩٥)، ل٢٧١ـ٢٨٤.

١٩ـ برێین م. جێكینز، *هاوشێوەی تیرۆری ناوەكی*، (سانتا مۆنیكا، كالیفۆرنیا، ڕاند، تەمووزی ١٩٨٥).

٢٠ـ هۆفمان، تیرۆری پیرۆز، ل٢٧٣.

٢١ـ مارك جویرگینزمیر، "*تیرۆری ڕێگەدراو لەلایەن خواوەند*"، گۆڤاری تیرۆریزم ئاند پۆلیتیكەل ڤایۆلێنس، ژمارە ٩ (هاوینی ١٩٩٧)، ل١٦ـ٢٣.

٢٢ـ D. W. Brackett، *تیرۆری پیرۆز: جەنگی یەكلاكەرەوە لە تۆكیۆ* (نیۆیۆرك: ویزەرهیل، ١٩٩٦) ل٥ـ٧.

٢٣ـ دێیڤید كاپلان و، ئەندریۆ مارشاڵ، *گروپی ئایینی لەكۆتایی جیهاندا* (نیویۆرك: كراون پۆبلیشەر، ١٩٩٦) ل٧٤.

٢٤ـ ستێرن، *دوایین تیرۆریستان*، ل٧٢.

٢٥ـ هۆفمان، *لە نێو تیرۆردا*، ل٢٠.

٢٦ـ هۆفمان، *تیرۆری پیرۆز*، ل٢٨٠.

٢٧ـ گێیڤن كایرۆن، *تیرۆری ناوەكی* (باسینگستۆك، ئینكلیزی: ماكمیلان، ١٩٩٩)، ل١٣٩.

٢٨ـ ئەمیر تاهیری، *تیرۆری پیرۆز: چیرۆكی ناوەوەی تیرۆری ئیسلامی* (لندن: هاچینسۆن، ١٩٨٧)، ل١٩٢.



٢٩ـ دانییێل بنیامین و، ستیڤن سیمسۆن، *چەرخی تیرۆری پیرۆز* (نیۆیۆرك: ڕاندۆم هاوس، ٢٠٠٢).

٣٠ـ ماگنەس ڕانستۆرپ، گۆڤاری *ستەدیس ئین كۆنفلیكت ئاند تیرۆریزم*، ژمارە ٢١ (ئۆكتۆبەر ـ دیسێمبەری ١٩٩٨)، ل٣١ـ٣٢.

٣١ـ شێخ ئوسامە بن موحەمەد بن لادن و، ئەیمەن لزەواهیری و، ئەبو یاسر رافیعی ئەبرود تەها و، شیخ میر هەمزە و، فەزلول رەحمان، "*بەیانی بەرەی ئیسلامی جیهانی بۆ هاندانی جیهاد لەدژی خاچپەرست و جولەكەكان*"، لندن، گۆڤاری القدس العربی، ژمارە ٢٣، شوباتی ١٩٩٨.

٣٢ـ ستیڤن سمسۆن و، دانییێل بنیامین، "*تیرۆر*"، گۆڤاری سیرڤایڤەڵ، ژمارە ٤٣ (زستانی ٢٠٠١)، ل١٢.

٣٣ـ مارك جویرگینزمیر، *تیرۆر لە بۆچوونی خوداوەند: بەرزبوونەوەی توندوتیژی ئاینی جیهانی* (بیركیلی: زانكۆی كالیفۆرنیا، ٢٠٠٠).

٣٤ـ گۆڕ و كۆل، ڕووی نوێی تیرۆر، ل١٤٤.

٣٥ـ GPO، نوسینگەی لێكۆڵینەوەی فیدراڵی، *پرۆژەی مێگیدۆ* ( واشنتۆن: ژمارە ٢٠، ئۆكتۆبەری ١٩٩٩).
http://permanent.access.gpo.gov/lps3578/www.fbi.gov/library/megiddo/megiddo.pdf.

٣٦ـ گۆڕ و كۆل، *ڕووی نوێی تیرۆر*.

٣٧ـ سەیری (گۆڕ ڤیدال، *جەنگی هەمیشەیی لەپێناو ئاشتی هەمیشەیی: چۆن وامان لێهات كە وەها رقیان لێمان بێتەوە*)، (نیۆیۆرك: ٢٠٠٢) بۆ بینیی ئەو بۆچوونەی كە وادەبینی باڵەخانەی فیدراڵی موراه لە ئۆكلاهۆما بۆی هەیە بەبێ پاڵپشتییەكی گەورە نەتوانرێ بتەقێنرێتەوە.

٣٨ـ دانییێل لیڤیتاس، *تیرۆریستانی دەرگاکەی دیکە: بزووتنەوە میلیشیاکان و ڕاستڕەوە توندەکان* (نیویۆرك: تۆماس دیون بوکس ٢٠٠٢).
٣٩ـ جێسیکا ستێرن، تیرۆر بەناوی خوداوە،: *بۆچی میلیشیای ئاینیی کوشتار دەکەن* (نیویۆرك: هارپورکۆلینس، ٢٠٠٣).
٤٠ـ ڕۆبێرت ج. لیفتۆن، *وێرانکردنی جیهان لەپێناو ڕزگارکردنی: ئەوم شیرینکیۆ، توندوتیژی وێرانکەر و،تیرۆری نوێی جیهانی* (نیویۆرك: میترۆپۆلیتان بوکس، ١٩٩٩).
٤١ـ جێمس د. وێلفینسۆن، "*گردنی جیهان بە شوێنێکی باشتر و ئارامتر: کاتی کارکردن ئێستایە*"، گۆڤاری پۆلیتیکس، ژمارە ٢٢ (ئایاری ٢٠٠٢)، ل ١١٨ـ١٢٣/ ئەندریۆ س. فێربەر، "*ئاو مەخۆرەوە...*"گۆڤاری بریتش میدیکەل جێرنال، ژمارە ٣٢٦ (٢٢ی ئازاری ٢٠٠٣)، ل٦٦٧/ جان نێدرڤین پیتیرس، "*نایەکسانی جیهانی*، گۆڤاری تێرد وێلد کوارتەرلی، ژمارە ٢٣ (دیسێمبەر ٢٠٠٢)، ل١٠٢٣ـ١٠٤٦.
٤٢ـ کارین ڤۆن هیپل، "*ڕیشەکانی تیرۆر: لێکۆڵینەوەی ئەفسانەکان*"، گۆڤاری پۆلیتیکەل کوارتەرلی، ژمارە ٧٣ (ئابی ٢٠٠٢) ل٢٥ـ٣٩.
٤٣ـ میکایل مۆسیو، *بازاڕی شارستانییەت و بەریەککەوتنی لەگەڵ تیرۆر*"، گۆڤاری انترناشنال سیکیوریتی، ژمارە ٢٧ (زستانی ٢٠٠٣)، ل٦.
٤٤ـ مۆسیۆ، "*بازاڕی شارستانیەت*/ ئودرێی کۆرت کرۆنین، "*لە دوای جەماوە: جیهانگەرایی و تیرۆری نێودەوڵەتی*"، : گۆڤاری انترناشنال سیکیوریتی، ژمارە ٢٧، (زستانی ٢٠٠٣)، ل٣٠ـ٥٨.
٤٥ـ کارلس و. کیگلی، جر. و، جۆرجی أ. ڕایمۆند، *پاککردنەوەی تارمایی وێستفالیا: بنیاتنانی سیستەمی جیهان لە هەزارەی نوێدا*، (ئەپەر سادل ریڤەر، ن. ج. پرێنتس هۆل، ٢٠٠٢).
٤٦ـ ستێرن، دوایین تیرۆریستان.
٤٧ـ هارڤی و. کوشنێر، *داهاتووی تیرۆریزم: توندوتیژی لە هەزارەی نوێدا*، (تاوزەندس ئۆوکس، کالیفۆرنیا: ساگ پۆبلیکەیشن، ١٩٩٨).
٤٨ـ لۆورێنز فیدمان، "*جەنگی جیهانی سێیەم*؟" گۆڤاری سێرڤایڤەل، ژمارە ٤٣، (زستانی ٢٠٠١)، ل٦١ـ٨٨.
٤٩ـ جیمس ئادامس، *سیخوڕە نوێکان* (لندن: هاچینسۆن، ١٩٩٤) ل١٨٠، ١٨٤
٥٠ـ ئایبید، ل١٨٠.
٥١ـ تاهیری، تیرۆری پیرۆز، ل١٠٠ـ١٠١.
٥٢ـ فرانك سمیت، "*ململانێی کەلتور، بن لادن، خەرتووم و، جەنگ لەدژی ڕۆژئاوا*"، جێینز انتیلیجێنس ریڤیو، ئۆکتۆبەری ١٩٩٨، ل٢٢.
٥٣ـ ئەدریان گویلك، چەرخی *تیرۆریزم*، (لندن I. B. تاوریس، ١٩٩٨) ل١٤٨.
٥٤ـ پاول ر. پیلەر، "*تیرۆر بە جیهانی دەبێ: گروپە توندڕەوەکان خۆیان دەگەیەنن بە سەرانسەری جیهان*"، گۆڤاری بوکینگس ریڤیو، ژمارە ١٩ (پایزی ٢٠٠١)، ل٣٤ـ٣٧.
٥٥ـ جۆن ئارکویلا، دێیڤید ڕۆنفێلدت، میکایل زانینی، "*تۆڕەکان، جەنگی تۆر و، تیرۆری چەرخی زانیاری*" *لە بەرەنگاربوونەوەی تیرۆری نوێدا*، یان ۆ. لێسەر، هەندێکی دیکە، MR-989-AF (سانتا مۆنیکا، کالیفۆرنیا: راند، ١٩٩٩)، ل٥١.

٥٦ـ پاول ج. سمیت، "*تیرۆری نێونەتەوەیی و شێوازی ئەلقاعیدە: بەرەنگاربوونەوەی واقیعە نوێکان*"، گۆڤاری پارامیتەر، ژمارە ٣٢، (هاوینی ٢٠٠٢)، ل٣٧.

٥٧ـ ئایبید، ل٣٧.

٥٨ـ جێسیکا ستێرن، "*دژمنی گۆڕاو*" گۆڤاری فۆڕێن ئەففێیر، ژمارە ٨٢، (تەمووز ـ ئاب ٢٠٠٣).

٥٩ـ برێین م. جێکینز، "*ئایا تیرۆریستان چەکی ناوەکی بەدەست دێنن؟*" پێداچوونەوە، لە کوشنێر، *داهاتووی تیرۆریزم*، ل٢٢٥ـ٢٤٩.

٦٠ـ ستێرن، *دوایین تیرۆریستان*، ل٧٠.

٦١ـ جینکینز، "*ئایا تیرۆریستان چەکی ناوەکی بەدەست دەهێنن؟*".

٦٢ـ وۆلتەر لاکوێر، *تیرۆری نوێ: توندڕەوەی و چەکی بەکۆمەڵ کوژ*. (نیویۆرک: ئۆکسفۆرد پرێس، ٢٠٠٠).

٦٣ـ وەزارەتی دەوڵەتی ئەمەریکا، *شێوازەکانی تیرۆری جیهانی*، ل٦٦.

٦٤ـ ئارکویلا، رۆونفێلدت و، زانینی، "*تۆڕەکان، جەنگی تۆڕ و، تیرۆری چەرخی زانیاری*".

٦٥ـ پیلەر، *تیرۆر بەجیهانی دەبێ*.

The origins of New Terrorism
Matthew J. Morgan

Parametters, Spring 2004

## ڕەنگدانەوەکان بۆ سەر تیرۆری هاوچەرخ

**ن: جیرالّد هۆلّتۆن**

**و: مەڕوان کاکل**

ئەو پەرەسەندنانەی کە جیهانی تیرۆری گرتووەتەوە، گۆڕانێکی مێژوویی بەسەردا هێناوە و بە قۆناغێکی گوێزرانەوەدا گوزەراندوویەتی، بە جۆرێك کە ئێستا تیرۆر لە چەشنی یەکەم و دووەمیدا یەکیان گرتووە و ئاوێتەی یەکتری بوون. چەشنی یەکەمی تیرۆر ئەو چالاکییانە دەگرێتەوە کە تاك یان گروپی بچووك ئەنجامی دەدەن و تیایدا ئامانجیان سەپاندنی تیرۆرە بەسەر تاك یان گروپی دیکە و، دواتریش لە ڕێگەی ئەوانەوە مەبەستیانە حکوومەت ملکەچ پێبکەن. بەڵام تیرۆر لە چەشنی دووەمیدا سەپاندنی حکومی لەخۆ دەگرێت کە هاوڵاتیانی نێوخۆیی یان بێگانە تیایدا دەبنە ئامانج. کە چی جۆری هاوچەرخ لە تیرۆردا کە جۆری سێیەمیەتی، بە هۆی گروپی گەورەتر پیادە دەکرێ، کە ڕاستەخۆ جەماوەری نێودەوڵەتی لە کردەکانیاندا دەکەنە نیشان. ئەم جۆرەی دواییان هەموو ئامراز و پێکهاتووەکانی سەرکەوتنیان بۆ فەراهەم بووە و لەبەردەستیاندایە. ئەم وتارە لە تیرۆری نوێ دەدوێ و مەبەستییەتی ڕوونی بکاتەوە کە چۆن بەهۆی توانایەکی



جەستەیی کەمی ئەنجامدەرانی، دەتوانن یادەوەری تاکەکەسی و مێژوویی بشێوێنن لە ڕێگەی ئەنجامدانی کارەساتی ماوەفراوان کە بۆ ئەم مەبەستە نەخشەی بۆ کێشراوە. لە ڕاستیدا چەشنی سێیەمی تیرۆر لەوانی دی ساناتر ئەنجام دەدرێت ئەویش بەهۆی فەراهەمبوونی ئاستی باڵای تەکنەلۆژیا. بەڵام نەتەوە بەئامانجکراوەکان بەشێوەیەکی تەقلیدی ڕووبەڕوویان نابنەوە، پێویستیان بەوە هەیە کە دژەکرداری بەرگریکارانەی هاوچەرخ، وەك وەڵامێك ئەم چەشنە هاوچەرخەی تیرۆر دابهێنن.

بەلای منەوە زۆربەی مشتومڕەکانی سەدەی بیست لە خاڵێکدا لاوازی پێوە دیارە، یان ڕوونتر بڵێین ئەم خاڵەی تێدا ونبووە، ئەویش نەبوونی یاسایەکی چاوەڕواننەکراوە لەگەڵ ویستی نێونەتەوەیی، چونکە ئێمە بە گۆڕانکارییەکی مێژوویی تێپەڕیوین کە گەڕانەوەی بۆ نییە.

تیرۆریزم هۆکارێکە بە مەبەستی ملکەچپێکردنی خەڵك یان سەرکردەکانیان یان هەردووکیان پیادە دەکرێت ئەویش لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی ترس یان گەیاندنی ئازار و خولْقاندنی چەرمەسەری. هەمیشە لەم کارانەیاندا ئەوەی کە سەرنجی ئێمە کێش دەکا، ئەو کردارانەیە کە هەوڵدەدەن لە ڕێگەیەوە تیرۆر و تۆقاندن بە هۆی کەسێکەوە یان گروپێکەوە بەسەر کەسێکی دیکە یان گروپێکی دیکە بسەپێنن، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بە حکوومەتی بگەیەنن. من ئەمە بە تیرۆری چەشنی یەکەم ناودەبەم. تۆمارەکانی تیرۆر ئەوە دەردەخەن کە لە هەر بارێك یان هەر ڕووداوێکی ئەم جۆرە کردارانەدا هەر لە تەقاندنەوەی باڵەخانە تا دەگاتە ڕفاندنی ئاسمانی، سێ خەسڵەتیان لەخۆ گرتووە:

١ـ ئەم چالاکییانە بە ڕێگەیەکی تەقلیدی ئەنجامدراون واتە لە ڕێگەی هۆکارە تەقلیدییەکانەوە.

٢ـ دەبن بە بەشێك لە زنجیرەیەكی درێژی ئەم جۆرە كردارە هەستپێكراوانە یان لەبیركراوانە، (ڕاپۆرتێك دەریخستووە كە لە نێوان ساڵانی ١٩٨٣ ـ ١٩٩٨، نزیكەی ٢٤٠٠ هێرشی تیرۆریستی بۆسەر وڵاتە یەكگرتووەكان لەلایەن تیرۆریستانی دەرەوە و ناوەوە، لەم چەشنەی تیرۆر ئەنجامدراوە).

٣ـ لە سەرووی هەمووی ئەمانەدا، لە كاتێكدا ئەوان ئامانجی سەرەكی خۆیان بەدەستدێنن لە ڕاكێشانی سەرنجی جیهان بۆ لای خۆیان بۆ ماوەیەكی دیاریكراو، یان بۆی هەیە سەركەوتنێك تۆمار بكەن لە پێشبڕكێیان لەگەڵ گروپەكانی دیكەدا، یاخود تامەزرۆیان بۆ ڕژانی خوێنی خەڵكی بێ تاوان تێربكەن ئەویش بە مەترسییەكی تاڕادەیەك كەم لەسەر ئاستی حكومیدا دەكەوێتەوە، بەڵام لە زۆربەی بارەكاندا سەركەوتوو نابن، سەرنەكەوتن بە لێكدانەوەی وەدەستهێنانی ئامانجە بوار فراوانەكانیان كە بریتییە لە ملكەچپێكردنی سیاسەتی حكوومەت بە قازانجی ئەوان. لێرەدا ئەو تێبینییە ڕەتكەرەوەیەم دێتەوە یاد كە لە نامەیەكدا لە سێپتێمبەری ١٨٧٠ لە (ف. ئەنگێلزەوە بۆ ك. ماركس) نووسراوە دەڵێ: (تیرۆر لە هەموو كردەوە دڕندانە بێ سوودەكان كە لە لایەن خەڵكی ترساو ئەنجامدراوە، بۆ ئەوە بووە تا لەخۆیان دڵنیابن).

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر تیرۆر لە چەشنی دووەمیدا، حاڵەتەكە تەواو پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی چەشنی یەكەم، كە بەم شێوەیە پێناسەمانكردووە: سەپاندنی تیرۆر لە لایەن دەوڵەتانەوە بەسەر كەسانێك یان چەند گروپێكی نێوخۆیی یان خەڵكی دەرەوە. هەرچەندە ئەم جۆرە لە تیرۆری جۆری یەكەم كەمترە، بەڵام ئەو كردەوانەی كە لەسەدەی بیستەمدا لەو ڕێگەیەوە ئەنجامدران، ژمارەیەكی یەكجار گەورەتری خەڵكیان كردووەتە قوربانی. سەرەڕای ئەمەش توانیویانە لە ئامانجە ڕاگەیاندراوەكانیاندا سەركەوتن بەدەستبهێنن، هەر لە بۆمبارانكردنی مۆسۆلینی



حەبەشییەكان و، كوشتنی هەموو پیاوەكانی شارۆچكەی لیدز لە تۆڵەی یەك پیاو، تا دەگاتە تەقینەوەكەی سەری ساڵ لە هانۆی ساڵی ١٩٧٢. لەگەڵ ئەوەشدا چەند حاڵەتێكی كەم هەیە كە تیرۆری چەشنی دووەم تێیدا سەركەوتوو نەبوو بێ، بۆ نموونە هێرشی بلیتزی ئەڵمانی بۆ سەر ئینگلترا و، كارە زۆرەملێكانی سوپای فەرەنسی لە جەزائیر.

من وای بۆ دەچم كە هەر یەك لە تیرۆری چەشنی یەكەم و هی دووەم لە سەردەمی ئێستاماندا بەرەوە توانەوە دەچن و، ئاوێتەبوونێكی هاوچەرخ لە نێوان ئەم دوو چەشنەدا دێتە ئارا كە بە پاڵپشتی و هاوكاری حكوومەتەكانەوە دەست پێدەكات لە بەئەندامكردن و پڕچەككردنی گروپە تیرۆریستییەكان و بەكارهێنانیان لەمەرامە نێونەتەوەییەكانی وەك: پاساو هێنانەوە و بەیاسایی كردنی تیرۆریزم وەك بەشێك لە پرۆسەكانی ئازادكردنی نەتەوەیی، هەروەها مەشقپێدان و چەكداركردن و پاڵپشتی دارایی بۆ تۆڕە تیرۆریستییە نێودەوڵەتییەكان لەلایەن وڵاتانی جۆراوجۆرەوە. ئەوەی دواییان ئاژانسی تیرۆریستی ڕوون بۆ دووانەكەی پێشووتر دابین دەكات، وڵاتانێك كە خاوەن توانای بەهێزی تیرۆرن و گروپی سەربەخۆی دیكەی خاوەن توانستێكی دیاریكراو، هاوكاری دەكەن و یەكدەگرن، لە شێوەیەكی نوێتردا دەردەكەون و كاردەكەن چی بە نهێنی یان بە هاوكارییەكی ئاشكرای كەم یان زۆر، لە سەر وێرانكردن ڕێكدەكەون، كە ئەویش جۆری سێیەمی تیرۆرە.

بۆ ئەوەی لە هێز و توانای ئەم جۆرە ئاشنابین، دەبێ ڕەچاوی ئەگەری بەكارهێنانی هۆكارە تەكنیكییەكان بكەین. چونكە هۆكارە تەكنۆلۆژییەكان لە قسەوباسی ئێستادا وەك چەكی ناوەكی و هۆكارە فیزیاییە وێرانكەر و سەرسوڕهێنەرەكانی دیكە، یان چەكی بایۆلۆژی و كیمیایی، تەنها بەشێكی ئەم قسەو باسانە پێكدێنن، تەكنیكی نوێ لە چەكدا و بەكارهێنانی دەتوانێ ماوەی

زەرەر و زیانەکان فراوانتر بکات، هەروەها لە ڕێگەی تەلەفیزیۆن و میدیاکانی دیکەشدا دەتوانێ بە بەردەوامی و بە دووبارەکردنەوەی هەواڵەکان و گەورەکردنی کردارەکان ئەمە بەدی بهێنێت، بۆیە ئەوان پێویستیان بەوە نییە کە خەڵکێکی دیاریکراو بخەنە ژێر فشارەوە، بێ گومان ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارە گرنگانەی کە بە هاوبەشی لەگەڵ ئەوانی دیکە ڕۆڵ دەبینێ لە سەرکەوتنی تیرۆر.

هەر ڕووداوێك یان کردەیەکی تیرۆریستی، چ لە لایەن کەسانێك یان گروپێك یان وڵاتێك یان هاوپەیمانییەك پیادە بکرێ، ئەوا لە قۆناغێکدا، چ سەرکەوتوو بێ یان نا، چوار پێکهاتووی هەیە هەریەك لەوانە بابەتێکە بۆ بەرفراوانکردنی بوارێك یان هەلێك لە ڕۆژگاری ئیمڕۆماندا.

١ـ فەراهەمبوونی توانا تەکنۆلۆژییەکان بۆ گروپە تیرۆریستییەکان.

٢ـ شێوازی ئێستای ژیانی ئاسایی (ڕێك و پێك) کە لەلایەن گروپی بە ئامانجکراو دەگوزەرێت.

٣ـ یادەوەری مێژوویی (فۆلکلۆر و ئەفسانەی دیکەی کۆمەڵایەتی) ی گروپە نیشانکراوەکە.

٤ـ باری سیاسی نێودەوڵەتی کە تیرۆرکاران و قوربانیان خۆیان تێدا دەبیننەوە.

یادەوەری مێژوویی

بۆئەوەی بە ڕوونی لەو خاڵە تێبگەین، دەبێ درك بەوە بکەین کە ئەو شێوازانەی تیرۆر لە جۆری دووەمدا لە کاتە زووەکانی مێژوودا تا ئێستا گرتوونیەتە بەر، قوربانی بێ ئەندازەی ناوەتەوە. جگە لەوە سەرکەوتووش بووە لە هێنانە ئارای گۆڕانکارییەکی بەهێز کە سروشت و بیری نەریتی کۆمەڵگەی بەو گۆڕانکارییەدا گوزەراندووە، بە چەشنێك کە ژیانی ئادەمیزاد توانای بیرکردنەوەی هەبوو, بەڵام لە ڕێگەی ئەو گۆڕانە کاریگەرەوە قوربانییەکان دەشێوێندرێن و لە بێگەردی



دادەماڵرێن و بە شێوەیەکی یاری پێکراو دادەتاشرێن. ئەمەیان گەورەترین وانەیە لە یەکەم نموونەی ئازار و ئەشکەنجەدان. لە پەرتووکی (کۆچکردن) دا، بەشی یازدەهەم هاتووە: "تا هاتنی پەتای دەیەم، یەکێك لەو هۆکارانەی کە شێوازی ئاسایی ژیانی خێزانەکان و پێکهاتەی کۆمەڵگەی میسرییە کۆنەکانی شڵەژاندبوو، بریتیبوو لە ئاستی تیرۆر بەڕادەیەکی بەرز کە توانیبوی ملکەچی بە بڕیارەکانی فیرعەونەکان بکا".

بۆی هەیە تیرۆری نوێ بە باشی بۆ ئەوە هەوڵبدات کاریگەرترین شوێن کە یادەوەری تاکە کەسی و مێژوویی قوربانییە ویستراوەکانی تیا بەدیدەکرێ دیاریبکات و لە وێوە گورزی خۆی بوەشێنێ. بە پێچەوانەوە، گروپێك یان سەرکردەکەی کە لە قوربانیدان دەترسێ بە هۆی هێرشی تیرۆریستانەوە، بۆی هەر دوو بارەکە تاقیبکاتەوە، یەکیان ناوچە لاوازەکانی کۆمەڵگەکەیەتی کە بەلای کەمی بەشێکی پارێزراوتر بێت، هەروەها ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی دروستبوونی رق و کینە لە تێڕوانینی جیهانی هێزی تیرۆرکاران و سکاڵاکانیان، بتوانرێ باشتربکرێت.

دەقاودەق چونکە ئەو بابەتە لە گفتوگۆیەکی وەهادا بەدەگمەن ڕەچاودەکرێ، بۆیە لادان لێی باشترە وەك لەوەی درێژەی پێبدرێ. بەڵام جیاوازی لە نێوان یادەوەری تاکەکەسی و مێژووییدا، ئەوەی یەکەمیان لە ڕووکەشەوە بە پاشماوەی خۆشی و ناخۆشی دیاریکراوی کەسەکە جیادەکرێتەوە، لە ئاستێکی قووڵتردا کە ڕەگە باریك و درێژەکانی لە خاکەوە دەردەچن، سیمای بە جیهانیبوونی دەبێ، کە لە توێژینەوە دەروونییە هاوچەرخەکاندا بابەتێك بۆ بەدوادا گەڕانی دڵسۆزی دێنێتە کایەوە.

بەلام یادەوەری مێژوویی بەشێکی ڕووداوی ڕاستەقینە و بەشێکی ئەفسانەییە، دەکرێ بە بەشێکی بچووکتر لە یادەوەری قووڵی کەسێتی دابنرێ. بەشێکی گرنگ لە ناوەرۆکەکەی بریتییە لە ئەگەری ڕووداوی کۆچکردن و هۆشدارکردنەوەی ڕەشبینانە و ڕووداوی پێشبینیکراو و نامۆ و ڕووداوە سیحراوییەکان کە لە ئەفسانە بنیاتنەر و ڕوخێنەرەکاندا هاتووەتە دەربڕین، هەروەها لەو چیرۆکانەدا کە ڕووداوە کەسییە هاوبەشەکان دەگوازێتەوە، وەك لە دایکبوون، ترسناکی، ڕاکردن و مردن، جگە لەوەش جیهانی چیرۆکخوان لە مەڕ ڕووداوەکان لەسەردەمی میرنشینە کۆنەکاندا و، جەربەزەیی و چاونەترسی سوپا و سەرکردەکانیان، یان کارەساتە سروشتییە گەورەکان (وەك بوومەلەرزەکەی سەدەی هەژدە کە لیشبۆنەی وێرانکرد، بۆیە یارمەتی گەشبینی ڕۆژئاوی دا لەو سەدەیە) لەخۆ دەگرێت. لە هەمانکاتدا بۆی هەیە ئەم چیرۆکانە چڕبوونەوەی ڕەگەزی لە خەڵکێکی دیاریکراوەوە پێوە دیاربێ، بەم شێوەیە لە (مۆتیڤ ـ ئیندێکس ی وێژەی خەڵك) دا کە ستیس سۆمپسۆن نووسیویەتی، تیایدا پۆلینکردنی سەرەتاکانی (باس ـ وتار) لە ڕێگەی بوارێکی فراوانی کەلتوور و کات دەوروژێنرێ. بەلام گرنگییەکەی لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هەردوو دژیەکەکە (کارەساتی جیهانی) و (دامەزراندنی سیستەمی سروشتی) لە نێو میتۆلۆجیای هاندانە هەرە زووەکاندا لیستکراون.

توانای بەکارهێنانی ئەو بنچینە سایکۆلۆژییە وەك بەشێکی قۆناغێك بۆ کردەی سیاسی ماوەییێکە ناسراوە، هەروەك لە پەرتووکی (ڕەنگدانەوەکانی سەر توندوتیژی ـ ١٩٠٨) کە ڕێبەرێکی خاوەن جەماوەرێکی زۆرە لە بزووتنەوە تیرۆریستییەکاندا، (جۆرج سیرۆڵ) ئامۆژگاری شۆڕشگێڕەکانی سەردەمی خۆی دەکات کە کەڵك لەو ئەفسانە کۆمەلایەتییانە وەربگرن کە ناوی هێناون، تیایدا دەڵێ:



"لەوانەیە چوارچێوەدانان بۆ داهاتوو زۆر کاریگەر بێت... ئەمە کاتێك ڕوودەدات کە پێشبینییەکان شێوەی ئەم ئەفسانانە وەردەگرن، کە لەگەڵ خۆیاندا هەموو خواستە بەهێزەکانی خەڵك و کۆمەڵ و چینەکان دادەخەن، ئەو خواستانەی کە لە هۆشەوە سەرچاوە دەگرن لەگەڵ مکوڕبوونی غەریزەکان لە هەموو هەلێکی ژیاندا، کە ڕوخساری واقیعێکی تەواو بۆ هیوای کردارە ڕاستەوخۆکان دەبەخشن، لێرەوە زۆر ساناترە وەك لە هەر ڕێگەیەکی دیکە بۆ مرۆڤ کە بتوانێ چاکسازی لە خواست و مەینەتی و چالاکییەکانی مێشکیدا بکات".

نووسەر لێرەدا لەوە دەدوێ کە هیچ مانایەکی نییە ئەگەر ئێمە بە تێروتەسەلی گفتوگۆ لەسەر ئەوە بکەین کە بۆ ماوەی چەند دەتوانین وەها ئەفسانەیەك بە شێوەیەکی ئەدەبیانە وەك داهاتووی مێژوو وەربگرین. "ئەوە ئەفسانەیەکە لە کۆی خۆیدا کە بەتەنیا گرنگە، بەشەکانی تەنیا لە دوورەوە گرنگن کە دەتوانن بیری سەرەکی بە دیار بخەن". هەروەها بەردەوام دەبێ بۆ ئەوەی پیشانی بدات کە ئەم بۆچوونە دەکرێ لە هەردوو باری سلبی و ئیجابی کەڵکی لێوەربگیرێ، بەو مانایەی نەك تەنها ئەفسانەیەکی کۆمەلایەتی سیستەمێکی کۆمەلایەتی جێگیر بکات، بەڵکو تێکشکاندن و جێگۆڕکێکردنی بە ئەفسانەیەکی دیکە، دەکرێ یان بڵێین پێویستە ببێ بە دۆخێك بۆ گۆڕانی ڕیشەیی لە کۆمەڵگەدا. ئەمە لە گۆشەنیگای ئەوەوە ئەرکی (توندوتیژی پرۆلیتاری) (سادەترین شێوەی دڕندایەتی) بوو. ئامانجی ئەو توندوتیژییەش بریتیبوو لە دروستکردنی دژە ئەفسانە لە دۆخێکی دیاریکراودا کە لە بەرژەوەندی ئەوبوو. ئەفسانەی (مانگرتنی گشتی.... ئەو ئەفسانەیەی کە سۆشیالیزم بە تەواوی لێیپێکهاتووە) تەواوی ناوەرۆکەکەی دوور لە داوای بۆ توندوتیژی لە پێناوخۆیدا، ئامانجێکی گەورەی هەبوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی مرۆڤ لەگەڵ کارەساتدا کە ئاماژە بۆ شۆڕشی ڕەها دەکات. لە هەمانکاتدا بۆی هەیە گومان ببرێت بە درێژدادڕی

بۆچوونەکانی (سیرۆڵ) کە دەڵێ: (ڕێگاکانی گۆڕان بەهۆی کارەساتی گەورەدا دێتە ئاراوە کە بۆ ئەم مەبەستە ڕێکدەخرێت) بەڵام ئەم بۆچوونە لە چەرخی تەکنەلۆژیای زۆر پێشکەوتووی ئەمڕۆماندا تەنانەت بۆچوونێکی زۆر بەهێزترە لەو چەرخەی کە سیرۆڵی تیادا بوو.

بەڵگەیەکی دیکەی بەناوبانگ لە بەکارهێنانی تیرۆر بە شێوەیەکی فراوان لە خزمەتی ئایدۆلۆژیادا، کتێبەکەی (لیۆن ترۆتسکی - تیرۆریزم و کۆمۆنیزم)ە سالّی ۱۹٦۱، کە لە ماوەی دوو ساڵدا لە سەردەمی سەرکەوتنی شۆڕی بۆلشڤیك لە شۆڕشی ڕووسیادا نووسراوە، لە بەشێکیدا لە ژێر ناوی (تیرۆریزم) بە بڕوا بەخۆبوونەوە لە پەڕەگرافێکدا نووسیویەتی: گرفتی شۆڕش هەروەکو هی جەنگ پێکدێت لە تێکشکاندنی ویستی دوژمن و ناچارکردنی بۆ خۆبەدەستەوەدان و ڕازیبوون بە مەرجەکانی داگیرکاران...ل٥٦.

**دۆزەکانی سەدەی بیست**

بۆ ئەوەی ڕۆڵی سەرەکی سەرکەوتنی کردەوەکانی تیرۆری جۆری دووەم لامان ڕوون و ئاشکرابێت، دەبێ تیشك بخەینە سەر بەشێکی تایبەت لە یادەوەری مێژوویی هاوچەرخ کە ئاماژە بە ئازار و مەینەتی ڕاستەقینەی ڕووداوەکان دەکات و هەر لەو ڕێیەوە ژینگە و بارودۆخی ژیانی ئاسایی مرۆڤ شێوێنرابوو. گەورەترین نموونەی ئەو مەینەتی و کارەساتانەش، بێگومان هەرگیز لە بیر و هۆشمان ساتێك دوور ناکەوێتەوە، کە هەڵدانی ڕژۆێکی دەستکرد بەسەر ئاسمانی هیرۆشیما و ناکازاگی بوو، کە شەپۆڵی گەرمی یەکجار بەرز و تۆزی تیشکە ڕادیۆییەکان و تیشکی ترسناکی (گاما)ی بەسەر ئەو دوو شارەدا باراند، ڕاستییەکەی ئەمە خستنەسەرێکی نوێی تەنێکی بۆشایی کاریگەر بوو بۆ ژینگەی ئەزموونی مرۆڤ.. سکرتێری جەنگی ئەوسای وڵاتە



یەکرگرتووەکان، (ستیمسۆن) بەوردی چاودێری ئەندامەکانی دەستەی زانستی خۆی دەکرد و ئامۆژگاری بە بەکارهێنانی بۆمبەکە دەکرد لە ۱۹٤٥/٥/۳۱، کە بەر لەوە تاقیکردنەوەیەکی دیکە بەسەر ئاسمانی (ئەلامۆرگۆ)دا ئەنجامدرابوو، بە چەشنێك کە نابێ بۆمبی ئەتۆمی تەنها حیسابی ئەوەی بۆ بکرێت کە بۆمبێکی نوێیە، بەڵکو خولقێنەری گۆڕانێکی شۆڕشگێڕانەیە لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و جیهاندا. وا پێدەچوو کە لە نێو ئەو زانایانەی ئامادەبوون، تەنها ستیمسۆن زوو درکی بەوە کردبێت کە چەکەکە بەدەر لە چوارچێوەیەکی ئاساییدا قوربانی دەنێتەوە، نەك تەنها قوربانیانی بە ئامانجکراو- بەڵکو بۆ خودی سەرکەوتووانیش.

بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆمی لەلایەن تیرۆری جۆری دووەم، بە دۆخێکی تەقلیدی سەرکەوتووی ئازار و مەینەتی دەژمێردرێت. بەڵام یادەوەری مێژوویی نموونەی دیکە لەخۆ دەگرێ کە هاوبەشە لە هەمان ئەو کاریگەرییانە، هەرچەندە ئەگەر هەمان بواری فراوانی کاریگەریشی نەبێ، هەروەك لە هەندێ دانیشگەدا، کاریگەری هەڵدانی مانگی دەستکردی نوێ (سپیوتنیك) لە ئۆکتۆبەری ۱۹٥۷ لە وڵاتێك کە بیر لەوە دەکرایەوە هەڕەشەیەك بێت، وەك هێستریاییێك بۆ خەڵکەکە وابوو، کە ئەم پرۆژەیە بە نهێنی کاری لەسەر دەکرا. حاڵەتێکی دیکە کە پەیوەندی پتەوی بە بابەتەکەوە هەیە، جێگۆڕکێکردنی هەوای ئاسایی بە گازی کوشندە کە لە جەنگی یەکەمی جیهان لە لایەن ئەڵمانیاوە بەرهەمهێنرا. سەرەتا هاوپەیمانان هەستیان بە مەترسی کرد، بەڵام دواتر هەر زوو خستیانە نێو پلانەکانی جەنگیان. هەروەك (گیلبێرت ف. ویتیمۆر) لە ئازاری ۱۹۱۸ تێبینی ئەوەی کرد کە گروپی توێژنەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان لە پەرەپێدانی پرۆسەیەکی سانا و کاریگەردا بۆ بەرهەمهێنانی دابینکەری گازی (موستارد ـ خەردەل) کە گازێکی کوشندەیە، لە لایەن هێزی سەربازی ئەمریکی لە سێپتێمبەری ۱۹۱۷ دا فەرمانی پێدرا. لە کاتی وەستانی جەنگدا توانرا لە هەر

ڕۆژێکدا ٣٠ تەن لە گازی خەردەل لە ڕووەکی (Edgewood) بەرهەمبهێنرێت. دواتر کیمیاگەران بە شانازییەوە ئاماژەیان بە دەستکەوتەکە دا و ئەوەیان ڕاگەیاند کە ئەمە هەڵەی ئەوان نییە کە ئەو بڕە یەکجار گەورەیەی گازەکە لە چەکی ئەمریکییەکاندا بەکارنەهاتووە، بەڵکو گازەکە ئامادەیە و چاوەڕێیە، بەڵام سوپا نەیتوانیوە دەزگای پێویست دابین بکا بۆ بەکارهێنانی لە چەکە جۆراوجۆرەکاندا.

هۆشیاری مێژوویی ئێستامان جگە لەمانە، حاڵەتی دیکەش لەخۆ دەگرێ کە بۆی هەیە مێژوونووسانی داهاتوو بیخەنە سەر لیستی ئەو پێشکەوتنانەی کە بەتەنیا سەدەی بیستەم جیادەکاتەوە. دەمەوێ ئاماژە بەدۆزینەوەی کەمپە جینۆسایدەکانی نازی بکەم لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهاندا، یان ڕێکتر بڵێین بەڵگەیەکی کۆتاییە کە ئەو ڕاستییانە دەسەلمێنێ بۆ ئەوانەی دەیانەوێ گرنگی پێبدەن یان بیزانن. پرۆسەکە بە هۆی ئەو کەمپانە بە شێوەیەکی ڕێکوپێك بەڕێوەدەچوو لە کوشتن و لەناوبردنی گروپی دیاریکراوی خەڵك لە ژێر دەسەڵاتداری ئەڵمانی. ئەم کەمپانە بۆ مەبەستێکی سێ لایەنە ڕێکخرابوون. تەنها بۆ ئەوە دانەمەزرابوون کە خەڵك دووربخەنەوە وەك لە باری ئاساییدا مەبەستە. بەڵکو کارگەیەکیش بوون بۆ دوورینەوەی ئەو خەڵکەی کە تیایدا بوون بە شێوەی بەرنامەیەکی داڕێژراو و بە خێرایی و بە ڕادەیەکی یەکجار گەورە. نیازێکی دیکە لە دانانی ئەو کەمپانە ئەوە بوو کە وەك کارایەکی تیرۆر و تۆقاندن کاربکات. بەدڵنیاییەوە، ئەگەر کەسێك لەم جیهانەدا ئاگای لە بوونی ئەو خەڵك نەبووبێ، بەلایەنی کەمەوە خەڵکەکە خۆیان لە بوونی خۆیان دڵنیابوون و دەیانزانی کە هەن، بەڵام دواتر لە ڕێگەی ئازار و ئەشکەنجەی جۆراوجۆر ملیۆنەها لەو خەڵکانە لەناو بران.

بە کارهێنانی تیرۆری دەوڵەت بە شێوەیەکی ڕێکوپێك و بەرنامە بۆ دانراو لە یەکێتی سۆڤیەتدا بە شێوەیەکی زۆر فەرمی لە لایەن (ریچارد پایپ) لە کتێبەکەیدا



(شۆڕشی ڕووسیا) (الفريد أ. نۆپف، ١٩٠٨) باسکراوە. لە بەشی هەژدەمدا (تیرۆری سوور) کاریگەری زووی خۆی بۆ نووسینەکانی لینین جێ دەهێڵێ کە لە وتارەکەیدا ساڵی ١٩٠٨، یەکەمجار بیرۆکەی لەناوبردنی چینەکانی دوژمنی هێنایە کایەوە. کاتێك کە دکتاتۆر بۆلشڤیك لەسەر حوکم بوو، تیرۆری کردە سیاسەتی دەوڵەت، کۆمیسەری لینین بۆ دادپەروەری لە ساڵی ١٩٢٠دا نووسیویەتی: " تیرۆریزم سیستەمێکە.... پلانێکی یاسای ڕژێمە بۆ مەبەستی تۆقاندنی بەکۆمەڵ و ناچارکردنی بەکۆمەڵ و لە ناوبردنی بەکۆمەڵ". هەموو ئەمانە لەدژی دانیشتوانی خۆیان پیادەکراون.

بەم شێوەیە سیاسەتی ئاسایشی سۆڤیەت دەستی والاکردبوو بۆ لەناوبردنی ژیانی ملیۆنەها هاوڵاتیان کە بەدوژمن لە قەڵەمی دەدان. بنکەکانی دەستگیرکردن... وەها ناوێك بۆ ئەم مەبەستە داهێنرابوو، یەکەمجار لەسەردەمی ترۆتسکی و لینین دامەزرا لە ئابی ١٩١٨ کە بەشێك بوو لە تیرۆری سوور، لە ساڵی ١٩٢٣ ژمارەی ئەم کەمپانە بووە ٣١٥. لەسەردەمی ستالینیشدا کەمپەکان هەم لەڕووی قەبارە و هەم لەڕووی ژمارەوە زیادبوونی گەورەیان بەخۆوەبینی.

لەڕاستیدا نامەوێ لەم وتارەدا بە دوای پاشماوەی دیاریکراوی ئەو سەدە تراژیدییە بکەوین لە مێژووی جیهاندا، بەڵام نەبوونی هەر ڕێکەوتنێك، هاندەرێك، یان هەر هێزێك کە خواستی ساردکردنەوەی ئەو پێشڤەچوونانە پەرەپێبدات و، سەرەڕای ئەوەش بەکارهێنانی تیرۆر لە هەردوو جۆردا، بێگومان هەر ئەوە ئاکامی دەبێ کە بوو. بۆیە دەبێ ئێمە چاومان لە قەدەغەکردنێکی جەوهەری بێت لە بەکارهێنانی شێواز و چەکەکانی ئەم جۆرە دیاریکراوەی تیرۆر بۆ ئەوەی بتوانرێت بەسەری زاڵبین. هەڵمەتەکانی پاکتاوکردنی نەژادی بۆ نموونە لە سیبریا و ڕواندا نمونەی زەقی ئەم چەشنەن لە ساڵەکانی دواییدا.

## سەرکەوتنی تیرۆر

من لەوە دوام کە ڕووداوە وێرانکەرەکان و گۆڕانکارییە کاریگەرەکانی دیکە لە ژیانی مرۆڤدا، یادەوەری تاکەکەسی و مێژوویی بۆ ئەودیوی سنووری دانیشتوان درێژدەکەنەوە، بە وێنەی ئەوەی کە لاستیێك مەودای ئاساییەکەی ببڕێت و گۆڕان لە سروشتی پلاستیکەکە بەدیبهێنێت، هەروەها گیان بەشێوەیەکی شێواوی جیاواز جێ دەهێڵن و ئامادەن کە ئەزموونەکان لە دەوری برینەکاندا بەکریستاڵ بکەن. کاتێك دەپرسین ئەو وانانە چین کە یادەوەری مێژوویی ئێستامان لەو ڕووداوانە وەریگرتووە، بەدڵنیاییەوە دیارترین وەڵام ئەوەیە کە (پاراستنی خودە لە ئاستی هۆشیاری). بۆمبی ئەتۆمی و مەنجەنیقەکانی ئاگری جەنگ هەرگیز نەبوونەتە بەشێك لە پرۆگرامی پەروەردەیی، بە پێچەوانەوە بۆ هاوڵاتیان ئامرازی سەرەکی پێشکەشکردنی حاڵەتەکانی تیرۆر بوونەتە شتێکی ئاسایی و هۆکارێکی قۆستنەوەی ئەم هەلە. بۆ نموونە ئەو فیلم و بەرهەمانەی تەلەفزیۆن کە لە تیرۆر و حاڵەتە ترسناکەکانی دەدوێن وەك (هیرۆشیما، مۆن ئامۆر و چەندانی دیکە) هەروەها دوایین ڤیدیۆ گێمەکان پشتیوانەکانی نازی بە شێوەیەکی ڕێك پێشکەشدەکات.

وانەی دووەم لە کارەساتی بەکارهێنانی چەکی تیرۆر لە جۆری دووەمیدا کە لە یادەوەری مێژوویی جێیهێشتووە، ئەوەیە کە بە تێکڕا ئەوان سەرکەوتوو بوون و، جگە لەوەش بەکارهێنانی چەکەکە نەبووە هۆی دروستبوونی دژە هاوسەنگ بوون و کەوتنەوەی زیانی گیانی گەورە بۆ بەکارهێنەرانی. بۆیە هیچ هۆکارێك لە ئارادا نییە کە چیدیکە جەربەزەیی داهاتووی ئەنجامدەرانی، بە درێژایی ئەو هێڵە هەنگاو بنێ.

لە کاتی دروستکردنی یەکەم بۆمبی ئەتۆمی ژمارەیەك لە زانایان لەسەر نەخشەسازی و بەرهەمهێنانی بۆمبەکە کاریان دەکرد کە بریتیبوون لە ( جیمس فرانك، یۆگن ڕۆبنویچ، گلین ت. سیبۆرگ، لیۆ سلیزارد و، هەندێکی دیکە) لە حوزەیرانی



١٩٤٥ لە ڕاپۆرتێکیاندا بۆ سکرتێری جەنگ تکای ئەوەیان کرد کە بۆمبەکە نابێ یەکەمجار هاوڵاتیانی مەدەنی بکاتە ئامانج. یەکێك لە مشتومڕە سەرەکییەکانیان ئەوە بوو کە: بەرژەوەندی سەربازی و ڕزگارکردنی ژیانی ئەمریکییەکان بە بەکارهێنانی کتوپڕی بۆمبی ئەتۆمی لە دژی یابان بۆی هەیە قەبارەیەکی زیاد لە خۆی وەربگرێ و ببێتە هۆی لەدەستدانی باوەڕ و، دروستبوونی شەپۆلی ترس و تۆقاندن و بە هەموو جیهاندا بڵاوببێتەوە و، بۆشی هەیە ڕای گشتی لە وڵاتدا بخاتە ململانێوە". بە دڵنیاییەوە ئامۆژگارییەکەیان گوێی بۆ نەگیرا و تەقینەوەکان کاریگەری ئازاربەخشی ویستراویان لەسەر سەرکردە یابانییەکان دەرخست. بەڵام وەك پێشبینی دەکرا (لەدەستدانی متمانە) و (شەپۆڵی ترس و ڕق و کینە لە جیهاندا بڵاو دەبێتەوە) نەهاتە دی، تەنانەت بۆ ماوەیەکیش نەبوو.

تەواو پێچەوانەی بۆچوونی زاناکان، نیۆیۆرك تایمز لە سەروتاری ١٩٤٥/٨/٧ دا دەستخۆشی لە بۆمبەکەی هیرۆشیما کرد و وەك کلیلێکی سیحراوی سەرکەوتن وەسفی کرد کە ئەمەریکا دۆزییەوە.... بۆمبە نوێیەکە بەڵگەیەکی تاجینەی تەکنیکی و پێشکەوتووی زانستی و ماددی هاوپەیمانانە بەسەر دوژمناندا.

لە نۆڤێمبەری ١٩٤٥ لە دەنگدانێکدا ئەوە ڕوون بووەوە کە تەنها ٥٪ ڕای گشتی ئەمەریکی دژی جەنگی بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆمی بوون. (هاری ترومان) کە بڕیاری بەکارهێنانی بۆمبەکەی دا، لەو بارەیەوە هاوبەشی بۆچوونەکانی دەنگدەرانی کرد و گوتی ئەو بۆمبە بۆمبێکی یاساییە، هەروەك ترومان لەدوای کارەساتی ناکازاگی نووسیویەتی:

" هیچ کەسێك وەکو من حاڵی پەشۆکاو نەبوو لە بەکارهێنانی بۆمبە ئەتۆمییەکان، بەڵام من زۆر لەوە پەشۆکاوتربووم بەرانبەر بە هێرشە ناڕاستەکەی یابان بۆ سەر بەندەری (پێرل) و کوژرانی گیراوەکانمان لە جەنگدا. بۆیە تەنها زمانێك کە

ئەوان لێی حاڵی دەبوون، هەر ئەوەبوو بە بەکارهێنانی بۆمب لە گەڵیاندا. ئەگەر تۆ بتەوێ مامەڵە لەگەڵ دڕندە بکەی، دەبێ دڕندانە لەگەڵی بجوڵێیتەوە".

**ئەنجام**

لەوەتەی ئەو نارەزاییانە ڕووبەڕووی جۆری یەکەم و دووەمی تیرۆر دەبنەوە، تا ئێستا هیچ کاریگەرییەکیان نەبووە و، هیچ هۆکارێکیش لە ئارادا نییە کە تیرۆری جۆری یەکەم، بەردەوامبن لە دیاریکراوکردنی خۆیان بەو هۆکارە تەقلیدییانەی هەیانە و چیدیکە کردەوە و پەلاماری سەرنەکەوتوو ئاکامیان بێ. بە پێچەوانەوە، هەمان بەردەوامی بەهۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیاوە دۆخی ئەو تیرۆرەی بەهێزتر کردووە، کە یەکبگرێ بۆ کارکردن لە نێو تیرۆری تاك و گروپدا لە شێوەی تیرۆری جۆری سێیەم. بۆیە ئەم بارە بۆی هەیە سێ پێشڤەچوون بەخۆیەوە ببینێ: یەکەمیان، هەوڵ و تەقەلای ولاتێك یان کۆمەڵێ لە ولاتان بۆ چاندنی تۆوی تیرۆری تەکنۆلۆژی و کەلتووری و ئامادەکردنی زەمینە بۆیان، نەك بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بەڵکو لەڕێگەی گروپی بەکرێگیراو، بە مانایەکی تر بۆ دڵنیابوون لە تێکەڵاو بوونی تەکنۆلۆژیای نوێ و نیازەکانیان لە بەکارهێنانی ئەو تەکنۆلۆژیایە لە ئازاردان و نانەوەی کارەساتی کاولکاری. دووەمیان، گرنگ نییە گروپەکان بە شێوەیەکی ئاشکرا بە ولاتێکەوە بەندبن، بەڵکو بە ئایدۆلۆژیایێکی ڕادیکاڵەوە پەیوەند دەبن کە هەمان تێکەڵاوبوون و خراپەکاری لەنێو خۆیاندا ئەنجامدەدەن. سێیەمیان، کاتێك کە نەتەوەیەك دەبێتە ئامانج بۆ شێوەیەکی نوێی تیرۆر، بێ گومان وەڵامی تەقلیدیان نادەنەوە و، دەبێ کردار و ئەنجامدانی نوێ دابهێنن بۆ هەردوو حاڵەتی: قەبوڵنەکردنی کردە تیرۆریستییەکان بە هەر نرخێك بێت و، داهێنانی سیاسەتێك بۆ ئەوەی ئەو حاڵەتانە لەکار بخا کە هێزە تیرۆریستییەکان دەخاتە جووڵەوە.



لێرەدا خاڵی کۆتایی ماوە بڵێین کاتێك کە تیرۆر لە جۆری سێیەمیدا بەرەو سەرەوەی ئاستی چالاکییەکانی هەڵدەکشێ، هەندێك تیرۆریستی دیکە دووچاری تێکشکان دەبنەوە بە تایبەتی لە یەکەم هەڵمەتەکانیاندا، چونکە هەر تەقەلایەك بۆ خوڵقاندنی زیان بە ڕادەیەکی گەورە، پێویستی بە کەرەستە و توانای تەکنەلۆژی دیاریکراو هەیە کە لەوانەیە سانا نەبێ بۆ ئەوانەی پێشتر تەنها خۆیان لە جۆری یەکەمی تیرۆردا دەبینییەوە، بتوانن ئەنجامی بدەن. ماوەکە لە پێشبڕکێدایە لە نێوان دابینکەرانی چەکی نوێ لە لایەك و بەکارهێنەرانی لە لایەکی دیکەوە، بۆی هەیە گەلێ فراوان بێ.. تەنانەت لە حاڵەتی ئەوەشدا کە ئەو چەکانە لە ولاتێکی پێشکەوتووشدا بەکاردەهێنرێن لە جەنگدا. بە هەر حاڵ، هەرچەندە چەکی بایۆلۆژی، ناوکی و، کیمیایی لە دەستی جۆری دووەمی تیرۆر سەرنەکەوت، بەڵام تیرۆی جۆری سێیەم دەتوانێ بەدەستیبهێنێ و لە ڕێگەی گەلێ هۆکاری ئازاربەخش ژیان لە گەلێ ناوچەی نەویستراودا وێرانبکات. دەقاودەق ئەم کارەساتەی سەرنەکەوتنە بۆی هەیە چاك بێت و بتوانێت خزمەت بکات ئەویش بە تێبینی کردنی ئەوەی بەردەوام بوون لە مێژووی جیهاندا تا سەرنابێت.

Reflections on Modern Terrorism

Gerald Holton

http://www.edge.org

## تەنگژەکانی تیرۆریزم

**ن: پاتریك هۆڵیز**

**و: هێمن غەنی**

لەم چەند ساڵە کەمەی دواییدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە هۆی چەند کردارێکی تیرۆرستیەوە کەوتە بەر هێرش و پەلامار، بەڵام لە هەموویان کوشندەتر و کاریگەرتر هێرشەکانی ڕۆژی یانزەی سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠١ بوون کە بە دواییدا ناردن و بڵاوکردنەوەی ماددەی ژەهراوی ناسراو بە ئەنسراکس لە سیمتی پۆستەی حکومیدا ئەوەندەی تر ئەم هێرشانەی سامناکتر و ئاڵۆزتر کرد.

هەر چۆنێك بێت، نابێت ئەو زنجیرە هێرشانە لە بیر بکەین کە لە بەراییدا کرایە سەر هێز و بارەگاکانمان، یەکەم هێرش لە دژی مەڵبەندی بازرگانی جیهانی ئەنجام درا، باڵەخانەی فیدراڵی لە ئۆکلاهۆما سیتی بۆمبڕێژکرا، هێرش کرایە سەر باڵۆیزخانەکانمان لە تەنزانیا و کینیا، لەگەڵ هێرشکردنە سەر تێکشکێنەری **٧٢٢** کۆڵ لە کەنداوی عەدەن لە یەمەن. چەندین هێرشی نەخشە بۆ داڕێژراوی دیکە توانرا پوچەڵ بکرێنەوە، شکستیان پێ بهێنرێت، لە ڕێگەی ئاگادارکردنەوە و هۆشدارکردنەوەی هاوڵاتیانەوە لە ڕێگەی کاری ڕێکوپێکی هێزەکانی پۆلیس و بەدەستهێنانی زانیاری ورد و ڕاست و درووستی هەواڵگرییەوە.

زیادبوونی ئاست و مەودای شەپۆلی چالاکییە تیرۆرستییەکان بە شێوەیەکی بەرچاو و هەستپێکراو دژی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جێی سەرنج و نیەگەرانییە. ئەگەر



بەهۆی سەرنجدان لە ڕووداوەکانی ڕابردوو بتوانین پێشبینی پێشهات و ئەگەرەکانی داهاتوو بکەین، ئەوا لە ماوەی مانگ و ساڵانی داهاتوودا بەدەست ژمارەیەکی زیاتری هێرشە تیرۆرستیەکانەوە گرفتار دەبین. مەبەستی دیار و ئاشکرای تیرۆرستان بەدەستهێنانی دەسەڵات و دەستڕۆیشتوویی زیاترە لە داهاتوودا. ئامانجی تیرۆرستان ئەو کەس و دامودەزگا ئەمریکیانە دەبن کە هۆشدارییان پێ ڕانەگەیەنراوە و نەپارێزراون.

چەند مەسەلەیەکی ڕوون و ئاشکرا لە ئەنجامی ئەو گفتوگۆ و مشتومڕانەوە بەرجەستە بوون کە دەربارەی شکستی هەوڵ و تەقەلاکانی پوچەڵکردنەوەی ئەو هێرشانەی لە پێشەوە باسمان کردن کرا.

ئایا ئەوەی پێشتر خرایەڕوو و باس کرا دەکرێت ببێتە ئاماژەیەك کە بەم نزیکانە ڕووبەڕووی هێرشێك دەبینەوە؟ دەبێت بە چ جۆرێك هەڵسوکەوت بکەین کە پێشتر نەمان کردوو، بۆ چی؟ دەتوانین چی بکەین بۆ ئەوەی ئاستی سەرکەوتنی تیرۆرستێك دابەزێنین بۆ خاڵی سفر؟ دەبێت چۆن و بە چ شێوەیەك ئەو سەرچاوە و ڕێگاچارە کەمانەی لەبەر دەستمان دایە بەکاربهێنین؟

بۆ ئەوەی بە تەواوەتی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە و بەرچاوی هاوڵاتیان ڕوون بکەینەوە ئەوا پێویستمان بەو زانیارییانە دەبێت کە نهێنین و یارمەتیدەرمان دەبن لە چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی هێرشە تیرۆرستیەکاندا.

بۆ ئەوەی ئەم زانیاریانەش سوودمان پێ بگەیەنن و بە ئاسانی بە کاریان بهێنین ئەوا دەبێت پۆلێنیان بکەین و بڵاوبوونەوەیان سنووردار بکەین ئەویش لە پێناو سەرکەوتنی پرۆسە ئەمنی و هەواڵگرییەکاندا، بە تایبەتی دەبێت ئەو ڕاستییەمان لەبەر چاو بێت کە تیرۆرستان سوود لەو زانیاریانە وەردەگرن کە بڵاودەبنەوە بە تایبەتی ئەو زانیارییانەی کە هەمانە دەربارەی جموجووڵەکانیان.

سەرکەوتنی ئەو لایەنەی هێرش دەکاتە سەرمان دەوەستێتە سەر بەنهێنی بەرێوەچوونی کار و کردەوەکانی، بەشێوەیەکی گشتی هۆی ڕاستەقینە و سەرەکی هەر شکستێکی تیرۆرستان ئاشکرابوونی ئەو کار و چالاکییانەیە کە هەوڵدەدەن بە نهێنی

بیبەن بەڕێوە و ئاشکرا نەبێت، کە لەم کاتەدا چالاکییەکانیان دەستنیشان دەکرێت و ڕێ و شوێنی پێویست دژیان دەگیرێتە بەر.

سەرکەوتنی هەر تیرۆرستێك دەگەڕێتەوە بۆ سەرکەوتنی لە پاراستنی نهێنیدا و نوشستهێنانی ئەو دەزگاو دامەزراوانەی کاریان بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزمە لەوەی دژە کردارێك دژی ئەو تیرۆرستە بگرنەبەر و یاخود نوشستهێنانیان لەوەی بایەخ بە وەرگرتنی ئەو دژەکردارە بدەن.

سیمای ئەم گرفتە — واتە نهێنی بوون لە هەموو لایەك، نەك تەنها کردارەکانی دژی تیرۆرستان ئالۆز کردووە، بەڵکو هۆشدارکردنەوەی هاوڵاتیانیشی دەربارەی هەر هێرشێکی تیرۆرستی نزیك ئالۆز کردووە. وەڵامدانەوەی ئەم مەسەلە گرفتارئامێزە ئاسان نییە.

نهێنیبوون ڕەگەزێکی پێویستە بۆ بەرەنگاربوونەوە و شەڕکردن لە دژی ئەو کەس و لایەنانەی کە ئامادەسازی و خۆ ئامادەکردنیان بۆ ئەنجامدانی کاری تیرۆرستی دەوەستێتە سەر نهێنی بوون، چارەسەریش لەوەدا خۆی نابینێتەوە کە هەرچی زانیارییەکمان دەربارەی تیرۆرستان هەیە ئاشکرا بکەین.

لەم کەشوهەوایەدا کە نهێنیبوون و نهێنیپارێزی تیایدا باڵادەستە، ئەوا هاوڵاتیەکی پڕچەك بە زانیاری و چاوکراوە باشترین پارێزگارییە لە بەرانبەر هەر هەلومەرجێکدا کە هەڵگری مەترسی بێت، بە تایبەتی ئەو مەترسیانەی پەیوەندییان بە تیرۆرستانەوە هەیە.

تەنگژەکە ئەوەیە (هاوڵاتی هۆشداریکراو) بە شێوەیەکی بنچینەیی جڵەونەکراوە و لەوانەیە بە شێوەیەکی زیادڕەوانە ڕەفتار بکات یاخود خەمسارد بێت ئەمەش دەگۆڕێت بەپێی گۆڕانی بارودۆخ و ڕوودانی گۆڕانکارییەکان وەك بەرپاکردنی هەڵمەتی چەواشەکاری و کاریگەری خستنەسەر هەست و هەڵوێستی هاوڵاتیان.

ئەوەی ئەوەندەی تر کێشەکەی ئالۆزکردووە ڕوونەدانی ئەو هێرشە تیرۆرستیەیە کە هاوڵاتیان ئاگاداردەکەینەوە دەربارەی ڕوودانی کە دەبێتە هۆی دروستبوونی هەستی



بێمتمانەیی لە نێوان هاوڵاتیاندا بەرانبەر هەوڵەکانی ئەو دەزگایانەی بۆ پاراستنیان کاردەکەن، تیرۆرستانیش دەستیان کردووە بە سوود لێ وەرگرتنی ئەم تەنگژەیە.

بە بۆچوونی، ئێستا کات بە دەستی ئەوانەوەیە (تیرۆرستان) و دیاریکردنی وادەی ئەنجامدانی کرداری داهاتوویان و ئامادەسازییەکان بۆی بە نهێنی دەمێنێتەوە، واتە بڕیار لە دەستی ئەواندایە. تەنگژەیەکی دیکە کە دەبێت لەبەرچاوی بگرین بارودۆخە، لە گۆڕەپانی جەنگدا، یاخود لەکەشوهەوای دوژمنداری و دژایەتی دا، نادڵنیایی و دڵەڕاوکێ شتێکی بەردەوامە، دوژمنان ناسراون و ئەگەری دەرکەوتنیان هەیە لە هەرساتێکدا، ئاستی ئاگاداری و ئامادەسازییەکان بەرزە و هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ پێشبینییەکاندا پێویستیەکی بە پەلەیە.

بەڵام لەم هەلومەرجە نوێیەدا کە ئێستا تیایدا دەژین و ئەزموونی دەکەین ئێمە لە جیهانێکدا کار دەکەین و بە جیهانێکدا گەشت دەکەین کە نائارامی و نادڵنیایی تێدایە بەڵام پێمانوایە بە شێوەیەك لە شێوەکان ئاسایش و سەلامەتی هەیە. هەڵدەستین بە کەمکردنەوەی خوسازدان و ئامادەکارییەکانمان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هەڕەشە و مەترسییەکان، پێشبینی و چاوەڕوانی دۆخێکی ئارام دەکەین کە تیایدا بەربەست و بەرتەسککردنەوە نەبێت بۆ جموجوڵ و ئازادیمان، هەروەها هەستێکی پێویستمان نییە دەربارەی ناسکی و ناسەقامگیری بارودۆخەکە، یاخود بەپێچەوانەوە ماڵەکانمان جێناهێڵین لەبەرئەوەی هەستی نائارامی و دڵەڕاوکێ بە سەرماندا زاڵە.

بەڵام ئەوەی ڕوونە خەڵکی ڕێگە نادەن هەڕەشەی سەرچاوە گرتوو لە تیرۆرستانەوە مافی کۆڕ و کۆبوونەوەمان لێ زەوت بکات، ئەگەرچی ئەم کۆبوونەوە و گردبوونەوانە ئامانجی لەباری تیرۆرستانیش بن.

لە ((گۆڕەپانی جەنگ))دا لە وڵاتە یەکگرتووەکان ئەم تەنگژەی بارودۆخە زۆر ئالۆزترە. ئێمە نامانەوێت پێشبینی نائارامی و ناسەقامگیری بکەین، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەگەرچی نموونەی ڕوون و ئاشکرامان لەبەر دەستدا بێت کە پاساو بن بۆ ئەوەی وریا و هۆشیار بین دەربارەی ئەگەری کردارە تیرۆرستیەکان. ئێمە هەستی

دەستوبردکردن و کەوتنە خۆی بە پەلەمان نییە. ڕەنگە دوای ٩/١١ کردبێتمان، بەڵام ئێستا بە هەمان ئاست و ئەندازە نییە.

هەر کاتێك هەستمان بە جموجولێك کرد کە ئەگەری مەترسی هەڵگرتووە ئەوا کاردانەوەمان تەنها بە ئاوات خواستن دەبێت کە کارێکی لەو چەشنە ڕوو نەدات. کاردانەوەکانمان جۆراوجۆرن، هەندێکیان بە شێوەیەکی زیادەڕەوانە دژە کردار لە بەرانبەر هەڕەشەی تیرۆرستیدا ئەنوێنن، هەڵدەستن بە خۆسازدان بۆ ڕوودانی کارەسات و دەست دەکەن بە تۆمارکردنی هەموو شتێك کە دەیبینێت وا دەیبیستێت کە لەگەڵ بیروبۆچوونی ئەواندا ناکۆکە. هەندێکی تر باوەڕیان وایە کە ناکرێت خۆمان لە ڕووداوی تیرۆرستی لابدەین لە داهاتوودا و کاردانەوەیان تەنها هیوا خواستنە بەوەی لە کاتی ڕوودانی کارە تیرۆرستیەکاندا ئەوان ئامادە نەبن لەو شوێنەدا.

دەسەڵاتداران، بەرپرسە حکومییەکان، پۆلیس، هەواڵگری و دەزگاکانی ئاسایش، هەموویان کاردانەوەی جۆراوجۆر و جیاوازیان هەیە لە پێناو ڕاگرتنی هاوسەنگییەکەدا، ئەوان بەردەوام لە هەوڵی خۆئامادەکردندان بۆ ڕوودانی هەر ڕووداوێك کە خوازیارن هەرگیز ڕوونەدات، بەڵام سەرەڕای ئەمەش هەر پێشبینی ڕوودانی دەکەن. ئەوان بارێکی دەروونی ئارامیان هەیە لە کەشێکی پڕ لە دڵەڕاوکێ و نادڵنیاییدا.

چەند کەسێکی کەم هەن کە لە پێگە و بارێکدان زانیاری جۆراوجۆر و تەواویان دەخرێتە بەردەست و، هێز و دەسەڵاتیان بەدەستە بۆ کارکردن، هەروەها بەرپرسیارێتی دانانی نەخشەی تێروتەسەل و گشتگیرییان لە ئەستۆدایە لەگەڵ ئەنجامدانی چالاکی هێرشبەرانە بۆ پوچەڵکردنەوەی کرداری تیرۆرستی.

بە شێوەکی گشتی ئێمە نازانین و، ناتوانین بزانین، ئەو کەسانە چی دەکەن و تەنانەت نازانین کێن، لەبەر ئەوەی سەرکەوتنی کارەکانیان پشت بە پاراستنی نهێنی و چالاکی ئەمنی کاریگەر دەبەستێت. بەم شێوەیە پارێزگاری کردن لە ژیان و ئاسایش و ئازادی ئێمە خراوەتە ئەستۆی ئەو کەسانەی کە ئەرکیان پاراستنمانە بەبێ ئەوەی ئاگاداری چۆنیەتی کارکردنیان بین، هەلومەرجێك کە گوزارشت لە نادڵنیایی دەکات و خەیاڵمان



بۆ تەنگژەیەکی تر دەبات کە تیرۆرستان بۆیان خولقاندوین — ئەویش ئەگەری پێشێلکردنی مافە دەستوورییەکانمانە لەم باردۆخە ئەمنییەدا.

گوێگرتن و کۆکردنەوەی زانیاری لە پەیوەندییە شەخسییەکانەوە زیاتر سروشتی ئەم کێشەیەمان بۆ شیدەکاتەوە، کە دەبێتە هۆی ئەگەری پێشێلکردنی مافی ژیان بەسەربردن بێ چاودێری و دەستێوەردان، ئەم چالاکییانە تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو بەکار دەهێنن بۆ گەیشتن بە زانیاری پتەو و باوەڕ پێکراو.

ئەم تەنگژەی بەدەستهێنانی زانیارییە تەنها چالاکییەك نییە کە دەبێتە هۆی داماڵینی ئازادی تاکەکەسیمان. پەرژین و بەربەستی چواردەوری باڵەخانەکان، ئامادەیی هێزی چەکدار لە شوێنە گشتییەکاندا، داواکاری و داخوازی بەردەوامی سەلماندنی ناسنامەکەت، سروشتی ئەو کۆبوونەوەی لەگەڵ کەسانی دیکەدا ئەنجامی دەدەین، لەگەڵ زۆرێکی تر لەو سیما و خەسڵەتانەی ژیانی (ئاسایی نوێ)مان هەموویان بوونەتە بەشێك لە هەوڵەکانی پاراستنی هاوڵاتیان لە ڕێگەی بەدەستهێنانی زانیاری زیاتر لەبارەیانەوە.

ئەم بارودۆخە پڕە لە نیگەرانی و دڵەڕاوکێی ئاشکرا، بەڵام ئەو بۆچوونەی پاساو بۆ ئەم بارودۆخە دەهێنێتەوەو بەڵگە و بیانوی نوێی بەهێزی هەیە، ئەوساتەی مەترسی چالاکییەکی تیرۆرستی لە ئارادایە بەبەکارهێنانی جەنگی ناوەکی و بایەلۆجی و کیمیایی، ئەوا ڕوون و ئاشکرایە کە بەرگەی ئەم چەشنە زەبر و پەلامارانە ناگرین. دەبێت هەرچی پێویستە بیخەینە گەڕ بۆ بەرپێگرتن و پوچەڵ کردنەوەی.

بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزم دەبێت خەم و بایەخی یەکەمی هەموو هاوڵاتیان بێت، ئەگەر هیچ هۆیەکی دیکەش لەبەرچاو نەگرین تەنها ئەو کۆت و بەند و بەرتەسك کردنەوە ئەمنیانە نەبێت کە دەخرێتەسەر ئازادییە تاکەکەسیەکانمان.

پێدەچێت چارەسەر لە دانان و گرتنەبەری چەندین ئاستەنگ و بەربەستدا بێت کە کار بکەنە سەر ژیان و ئازادیمان، بەڵام دەبێت ئەوەمان لەبەرچاو بێت کە هەڕەشەکە ڕاستەقینەیە. تەنگژەیەکی دیکە گرفتارمان دەکات ئەوەیە چی بکەین بۆ

ئاگادارکردنەوەی هاوڵاتیان و هەڵسوکەوتکردن بە پێی ئەو زانیارییانەی جێی مەترسی و نیگەرانین؟

گرفتی کۆکردنەوە و شیکردنەوە و بڕیاردان لەسەر بڵاوکردنەوە و هەڵسوکەوتکردن بەپێی ئەو زانیارییانەی دەربارەی تیرۆریزم هەمانە بە پێی هەلومەرجە ئەمنی و هەواڵگرییەکە دەگۆڕێت؛ لەبەر ئەوەی بەدەگمەن زانیارییەکان ڕوون و دیاریکراون.

وای دانێ کە هەندێ زانیاری دەگاتە دەستی دامودەزگا پەیوەندیدارەکان لە لایەن سەرچاوەیەکی پۆلێنکراوی باڵاوە، ئەو سەرچاوەیەی پشت بە نهێنی هەمیشەیی دەبەستێت بۆ ئەوەی جێی باوەڕ و دڵنیایی بێت. لەوانەیە زانیارییەکە سەدلەرسەد ڕاست و دروست نەبێت، بەڵام شایستەی سەرنجدان و سوود لێوەرگرتنە.

ئەم زانیارییە ئاماژە بە ئەگەری ڕوودانی هێرشێکی تیرۆریستی دەکات لە ئێستادا یاخود لە ئایندەیەکی نزیکدا کە بۆی هەیە ببێتە هۆی پوچەڵکردنەوەی. ئەگەرچی، وردەکاری گرنگ و پێویست بزرە، وەك کات و شوێن و سروشتی ڕووداوەکە، بەڵام زانیاری تەواو لەبەردەستدان کە وامان لێبکات ئاگاداری بدەینە هاوڵاتیان.

ئاڵۆزی ئەم گرفتە لێرەدا ئەوەیە گەر هاتوو لەکاتی هۆشدارکردنەوەی هاوڵاتیاندا ئەو زانیاریانەمان ئاشکرا کرد کە لە سەرچاوەکەوە وەرمانگرتووە، ئەوا دەبێتە هۆی ئاشکراکردن و پەردە هەڵماڵین لەسەر سەرچاوەکە، ئەگەر واشمان نەکرد ئەوا ڕووبەڕووی دەرئەنجامی نەویستراو دەبینەوە.

هەندێك بە باوەڕی پتەوەوە لە ئاگادارکردنەوەکە تێدەگەن و پەسەندیشی دەکەن. هەندێکیش متمانەیان بە ئاگادارکردنەوەکە نییە و ڕەخنەی لێدەگرێت. کەسانی دیکەش هەن باوەڕیان بە سیستەمی کۆکردنەوەی زانیارییەکان نییە. دەستەواژەی ((ئاسمانی دەروخێت)) وردە وردە کاریگەری بەجێ دەهێڵێت.

دەستنیشانکردنی ئاسەوارەکانی ئاگادارکردنەوەکە زەحمەت دەبێت کاتێك کە هیچ شتێك ڕوو نادات. ئاگادارکردنەوە کارێکی پێویستە بەڵام دەرئەنجامەکەی جێی نارەزاییە. وای دابنێ کە ئاگادارکردنەوەکە گشتی بووە، ئەگەرچی هەندێ جار واش نەبووە، تیرۆریستانیش بە هەمان شێوە ئاگایان لەم بارودۆخە بووە و، کات و ساتی



ڕووداوەکە بە دەستی ئەوانە، دەتوانن بیوەستێنن و بەپێی هەڵسەنگاندنیان بۆ بارودۆخە ئەمنییەکە و تێگەیشتنیان لەو هەلەی بۆیان ڕەخساوە چالاکییەکەیان ئەنجامبدەن.

ئەگەرچی لەوانەیە ئەوەی باسمان کرد بەو ساناییە نەبێت، بەڵام کەشوهەوای ئاگادارکردنەوە لە شوێنە گشتییەکاندا پێدەچێت لە بەرژەوەندی تیرۆریستەکان بێت کاتێك بارەکە خۆگونجاندن و خۆگۆڕین دەخوازێت.

لە نموونەیەکی دیکەدا، زانیاری پچڕ پچڕ دەکاتە ئاژانس و ڕێکخراوە جیاوازەکان، لەم بارودۆخەدا زانیاری پچرپچر بەس نییە بۆ ئەوەی هاوڵاتیان ئاگادار بکەینەوە لە مەترسی ڕوودانی ڕووداوێك، بەڵام کاتێك زانیارییەکان پێکەوە کۆدەکرێنەوە ئەوا مانا و شێوەی زانیارییە کۆکراوەکان دەردەکەون.

ئەمەش لە کاتێکدا ڕاست و دروستە کە شیکەرەوەی زیرەك و بە ئەزموون هەستێت بە لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئەم زانیارییانە و بیانخاتە چوارچێوەی ڕاستەقینەی خۆیانەوە. دەرئەنجامەکان لێرەدا بەسن بۆ ئەوەی هاوڵاتیان ئاگادار بکرێنەوە، بەڵام ڕوونکردنەوەی سروشت و وردەکارییەکانی ئەم ئاگادارکردنەوەیە زۆر زەحمەتە بەبێ ئەوەی ئەو سیستەمە لەناو بەرین کە بەرهەمی هێناوە.

ئێمە بە هۆی شیکەرەوەکان و بیر و بۆچوونەکانیانەوە ئاگادار دەکرێنەوە بەبێ ئەوەی ڕاستی و وردەکارییەکانمان پێبدرێت. بە داخەوە ئێمە دوای لێکۆڵینەوە ڕووبەڕووی ئەو ڕاستییە دەبینەوە کە زانیارییەکان بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ لەبەر دەستدا بوونە بەڵام لێکنەدراون و کۆنەکراونەتەوە تا بە هۆیەوە ئاگادارکردنەوە بدرێت بە هاوڵاتیان، بەهۆی نەبوونی میکانیزمێکەوە بۆ ئەو پرۆسەی لە سەرەوە باسمان کرد.

لە هەندێ حاڵەتدا زانیارییەکان شیکراونەتەوە و هەوڵدراوە بۆ ئاگادارکردنەوەی هاوڵاتیان بەڵام بەبێ ئەنجام، بەهۆی تێکچوونی زنجیرەی دەسەڵات و بەرپرسیارێتییەوە. لە هەندێ حاڵەتدا ئەم کەموکورتییە دەستنیشان کراوە، بەڵام کاری پێویست نەگیراوەتە بەر بۆ چارەسەر کردن و بنەبڕکردنی.

بیرۆکراتیەت و بیرکردنەوە و شیکردنەوە لەسەر ئاستی ناوچەیی ئەو کۆسپ و ئاستەنگانەن کە ڕێ لە لێکدان و کۆکردنەوەی زانیارییەکان دەگرن لەگەڵ نەبوونی شیکەرەوەی شارەزا بۆ ئەو زانیارییانە.

ئەو وردەکارییانەی لەبەر دەستدان ئەوەندە ڕوون نین بتوانین بیر لەوە بکەینەوە ئاگادارکردنەوە دەربارەی ڕووداوێکی نزیك و چاوەڕوانکراو ڕابگەیەنین. بەڵام، بەبێ گرتنەبەری ڕێ و شوێنی پێویست بۆ پاراستنی سەرچاوەکان، چاودێرەکان، شێوازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری و خودی زانیارییەکان، لەگەڵ نەبوونی میکانیزمی پەسەندکراو و باوەڕپێکراو بۆ هۆشدارکردنەوە و ئاگادارکردنەوەی هاوڵاتیان، ئەوا دەبێت بە بەردەوامی وەڵامی بارودۆخە پڕ لە دڵە ڕاوکێیەکان بە کرداری نا پتەو و ناجێگیر بدەینەوە.

هەوڵ و کۆششێکی زۆر دراوە بۆ تێگەیشتن لەو شێواز و زمانە جیاوازەی وەك ئامرازێك لەلایەن تیرۆریزمەوە بەکاردەهێنرێت. گرنگە سەرنجی ئەوە بدەین کە تیرۆریزم بە سروشتی خۆی ئەو چەمکە کۆن و مۆدێرنە لەخۆدەگرێت، واتە بەکارهێنانی شێواز و ڕێگای کتوپڕ و چاوەڕوان نەکراو و هێز و توانای ناتەقلیدی بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن.

هەروەها دەبێت ئەو راستییە لەبەرچاو بگرین کە ئەنجامدانی هەر کردار و چالاکییەك لە کاتێکی چاوەڕوان نەکراو بە خێراییەکی چاوەڕوان نەکراو ڕەگەزێکی بنەڕەتیی و گرنگە بۆ سەرکەوتن. هەر ئەمەشە توانایەکی بەهێز بە تیرۆریزم دەبەخشێت بۆ چاندنی ترس و دڵەراوکێ دەبێت بایەخ بە هونەری پێشبینی کردنی ڕووداوی تیرۆریستی داهاتوو بدەین، ئاگاداری پێویست لە بارەیەوە ڕابگەیەنین.

دانان و بڵاوکردنەوەی دامەزراوە و چاودێری هەواڵگری پێدەچێت کردارێکی گونجاو و لەبار بێت کە تیایدا بە سەرکەوتوو دەردەکەوین، بەپێی ئەو توانست و ئیماکانیەتانەی لەبەردەستدان، پێویستمان بە هەندێ لە باشترین شێوازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری هەیە، بەتایبەتی لە بواری هەواڵگری مرۆییدا. هەرچەندە ئەرکێکی پڕ لە سەختیە، بەڵام هەم پێویست و هەم شایستەی ئەو باجەیە کە لە پێناویدا دەیبەخشین.



ئێستا ئێمە سەرقاڵی ئەنجامدانی ئەم ئەرکەین کە ئومێدەوارین دەستە هەڵبژێراوەکان، مەشق کردنەکان، پاڵپشتەکان، سیاسەت و ئیجرائاتەکان لە ئاستی ئەم ئەرکەدا بن. کەواتە ئێمە بەرەنگاری ئەم تەنگەژانەو تەنگژەی دیکەشە دەبینەوە کە سەرچاوەی مەترسی روون و ئاشکران لە سەر ئازادی هاولاتیان.

هەر چۆنێك بێت پێویستە جەخت لەسەر بەدەستهێنانی سیستمێکی پەسەندکراوی پاراستن و بەرپێگرتن و پووچەڵکردنەوە و کاردانەوە بەرانبەر گرفت و تەنگژەی تیرۆریزم بکەینەوە بەبێ دەست هەڵگرتن لەو بیر و باوەڕ و بنەمایانەی بە هۆیانەوە ڕێگای سەختیان بەرەوە دواڕۆژمانی پێ دەربڕین.

ئەم ئەرکەش بە کۆمیتە و چالاکییە سەربەخۆکان یاخود بەو ئاژانس و ڕێکخراوانەی لەسەر ئاستی ناوچەیی کار دەکەن ئەنجام نادرێت. لە بری ئەوە دەبێت شێوازی کرداری و هەندێ شێوازی مەرکەزی لە لایەن سەرکردە پەیوەندیدار و شایستەکانەوە بگیریتەبەر و پەیڕەو بکرێت. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەبێت سەرۆك یان سەرکردایەتی ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆ.

ئایا داهاتوو چی لە هەگبەیدا هەڵگرتووە؟ لە باشترین حاڵەتدا دڵەڕاوکێ و نیگەرانی.

ئەگەرەکان جێی مەترسی و نیگەرانین و لەوە ناچێت چارەسەرەکان باش و یەکلاکەرەوە بن بۆ هۆکارەکانی تیرۆریزم کە خستمانە ڕوو. ئێمە بێ دوودڵی پێویستمان بە پوچەڵکردنەوەی هێرشە تیرۆریستەکانە.

تەنگژەی ئێمە ئەوەیە چۆن ئەم ئەرکی پوچەڵکردنەوەیە ئەنجام بدەین بەبێ ئەوەی سازش لە سەر ئەو ئازادی و بەهایانە بکەین کە شێوەی ژیانمانی دیاری کردووە.

The Dilemmas of Terrorism

Patrick M. Haphes

http://www.mrfa.org